# وڵامی

# گومانی تکفیر عمومەکان



ئامادەکردنی :
دابان تەوحیدی

دیزاین و ڕێکخستنی :
سیامەند عبداللە



ناوی کتێب :  وڵامی گومانی تکفیر عمومەکان

ئامادەکردنی : دابان تەوحیدی

دیزاین و ڕێکخستنی : سیامەند عبدالله

2020



بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

# پـــێـــشـــەکـــی

الحمد لله رب العالمين ، والعاقبة للمتقين ، والصلاة والسلام على عبده ورسوله وأمينه على وحيه وخليله وصفوته من عباده نبينا وإمامنا وسيدنا محمد بن عبدالله ، وعلى آله وأصحابه ، ومن سلك سبيله ، واهتدى بهـداه إلى يـوم الديـن.

بە یارمەتی الله تعالی وەڵامی ئەو شوبهە و گومانانەی خەواریجەکان دەدەینەوە کە استدلالی پێ دەکەن بۆ تەکفیر عموم ، کە خۆی لەخۆیدا یەکێک لە أصولی خەواریجەکان تەکفیری عمومە ، بۆیە براکانم هەرگیز گوێ شل مەکەن بۆ شوبهەکانیان وە سەرسام مەبن بەوەی کە دەیڵێن چونکە تەنانەت موشریکێک کاتێک لەبەر قەبرێک دەپاڕێتەوە و هاناو هاواری لێ دەکات بەهەمان شێوە ئەویش بەڵگە بۆ قسەکانی دەهێنێتەوە ، تەواوی فرقە و تاقمە گومڕاکان لە مێژووی ئیسلامی ـدا بۆ ئەو مەنهەجەی کە لەسەری بوونە بەڵگە دەهێننەوە ، بەڵام چۆن چۆنی ؟؟؟ بەو شێوەیەی کە خۆیان پێیان خۆشە تەئویلی بۆ دەکەن ، کەواتە هەموویان بەهۆی تەئویل کردنی نەصەکان بەڵگە بۆخۆیان دەهێننەوە ، بۆیە کاتێک کە ئێمە دەڵێین قورئان و سوننەت بە تێگەیشتنی صەحابە بە تێگەیشتنی سەلەف ئەوە ئەوکات ڕاستەڕێکە ئەدۆزینەوە و لە مەنهەج و بەرنامەی گومڕاکان لادەدەین ، بۆیە لەئێستادا زۆر گرنکە ڕەددانەوەی خەواریجەکان چونکە بوونەتە هۆی پەرتەوازە کردنی ئەهلی تەوحید و جیهاد ، بۆیەش إن شاء الله لێرەدا ئەوەی کە ئەوان بە بەڵگە دەیهێننەوە ڕوونی دەکەینەوە.

**بە پشـتیوانی اللـە تعـالی دەسـت دەکەیـن بە زنجیـرەیەک پۆسـت لە وەڵامـی گومانەکانی غولاتەکان ئەدەینەوە کە استدلالـی پێ دەکەن بۆ تەکفیر عموم..**

# گومانی یەکەم:

بەڵـگە دەهێنـنەوە بەم ووتەیەی **ابـن قدامـة** کە لە (المغنـي1638 / )
فــەرمــوویەتــی: **ئەگەر مـردوویەک دۆزرایەوە ، نەدەزانـدرا کە ئایا موسـلمانە ئەم کەسـە یـاخود کـافرە ، ئەوا سـەیری نیشـانەکانی دەکرێـت ، لە خەتەنە کـردن ، وە لە پۆشـاکیدا ، وە لە خەنە پێـوە بـوون ، جـا ئەگەر هـیچ نیشـانەیەک لەمـانە لێـی بەدەر نەکەوت وە لە دار الإسـلام ــیش بـوو ، ئەوا دەشـۆردرێت ، وە نـوێژی لەسـەر دەکرێـت ، وە ئەگەر لە دار الکفـریش بـوو ]** دەڵـێم : **واتە هـیچ نیشانەیەکیشـی لـێ بەدەر نەکەوتبـوو [ ئەوا ناشـۆردرێت ، وە نـوێژی لەسـەر ناکرێـت** ، وە **ئیمامـی أحمـد** ــیش هەمـان دەقـی لەسـەر ئەمە هێنـاوەتەوە ، لەبەر ئەوەی ئەصـل ئەوەیە کە هەر کەسـێک لەهەر دارێـک بـوو ، ئەوا لە ئەهلـی ئەو دارەیە ، حـوکمی دارەکـەیـان لەسـەر ئەچەسـپێ مـادام بەڵـگەیەک نەبـوو لەسـەر پێچەوانەکەی .

## وەڵام : دەڵێم:

ئەمە بەڵـگەیە لەسـەریان نەوەک بەڵـگە بێـت بۆیـان ، جـا بەڕاسـتی زۆر سـەیرە کە چـۆن اسـتلال بەمە دەکەن و ئەمە دەکەنە بەڵـگە ، چـونکە **ابـن قدامـة** تەنهـا چەنـد نیشـانەیەکی کـردووەتە بەڵـگە لەسـەر ئیسـلامەتیەکەی لە ظـاهر و ڕووکەشـدا چجـای ئەوەی کە بگـات بە کەسـێک کە شـەهادە و نـوێژ کردنمـان لێـی بینیـوە ، پاشـان فەرمـووی جـا ئەگەر لە خـاکی ئیسـلام نەبـوو وە هـیچ نیشانەیەکیشـی لـێ بەدەر نەکەوتبـوو ئەوا لێـرەدا حـوکمی دارەکەی پـێ ئەدرێـت جـا کـوا بەڵـگە لەم نەصـەدا بۆیـان بەڵکـو ئەمە بەڵگەشـە لەسـەریان !! وە

ئەم ووتەیەی کە فەرمووی : ( **وە ئەگەر لە دار الکفریش بوو** ) دەڵێم : واتە هیچ نیشانەیەک لەو نیشانانەی کە باسی کرد لێی بەدەر نەکەوتبوو هەروەکو چۆن لە سیاقی قسەکانیدا ئەمە زۆر ڕوونە.

بە بەڵگەی ئەوەی کەوا لە کۆتاییەکەی فەرمووی : **حوکمی دارەکەیان لەسەر ئەچەسپێ مادام بەڵگەیەک نەبوو لەسەر پێچەوانەکەی ( وە بەڵگە و دەلیلیش بریتییە لە شەهادە یان نوێژ کردن یان هەر نیشانە و شەعائیرێک ).**

# گومانی دووەم :

بەڵـگە دەهێنـنەوە بەو ڕیـوایەتەی کە لە **أبـوبكرى الصـديق** ـەوە ڕیـوایەت کـراوە کـــە لـــە ڕۆژانـی **ڕیـــــدە** فـــەرمـــوویـــەتـی : **إن الأرض كــافــرة**

(رواه بطوله الأثر في تاريخ الطبري (2/476) والبداية والنهاية[(9/441)

**وەڵام:**

ئـــەم چـــیـــڕۆکە مـــونـــکـــەر و بـــاطـــلـــە ( مسلسلة بالمناكير من الرواة )

لەوانـیش : ( **سـەیف ـــی کـوڕی عـومەر** ) منكر الحـديث ـــە , هەروەهـا ( **قاسـم ـــی کـوڕی محمد** ) ڕیـــوایەتـــی کـــردووە کـــە مـــرســـلـــة ـــە , وە هەروەهـا لە سـەنەدی چیـڕۆکەکە **شـێخی الطـبري** هەیە نـاوی( **السـري** )یـە کـە **ضـعیفە !** جـا چـۆن بەڵـگە دەهێـنـنەوە بە ڕیـوایەتە مـونکەر و باطلەکـان لەسـەر بـابەتە عەقیـدەییەکان !!! پاشـان لەفـزی کـافرة لێکـدراوەتەوە بە مظلمـة هەروەکـو چـۆن لە حاشـیەی تـاریخی بـن عسـاکر هـاتووە .. جـا نە فەهـم و تێگەیشـتنێکی ڕاسـت و درووسـت و صـەحیحیان هەیە نە بەڵگەیەکـی ثابـت و جێگیـر ، وە نە سـەنەدێکیان هەیە کە لەگەڵ مەفهـومە سـەقەتەکەیان ڕێـک بکەوێـت لەلایەن خەواریجەکانەوە. !!!

# گومانی سێیەم :

هەروەها بەڵگە دەهێننەوە بەو قـانەی کە وتراوە لە پێـناسەی **دار الكفر** وەک:

1) **ئیمامی مالک** لەبـارەی مەککە پـــێـــش فـــەتـــح کردنی فـەرموویەتی:

**وە ئەم خـاکە لەو کاتـدا دار الحـرب بـوو ، لەبەرئەوەی ئەحکـامی جـاهیلیەت ئاشکرا بوو ئەوکات.** ( المدونة ) (2/22)

## دەڵێم :

ئەم ووتەیە ووتەی **مالـک** نیـیە هەروەک وا گومانیـان بـردووە بەڵکـو ئەمە ووتەی ابن القاسم ـە هــەروەک چـــۆن ئەمە لە سیاقی قسەکانیدا ڕوونی دەکـاتەوە.

2) ئینجا **ابن مفلح** فەرموویەتی:

**هەر دارێـک ئەحکـامی موسـلمانان زاڵ بێـت بەسـەریدا ئەوا دار الإسـلامە ، وە ئەگەر ئەحکـامی کـافرانیش بەسـەریدا زاڵ بێـت ئەوا دار الكفـرە ، وە جـگە لەم دوو دارە هیچ دارێکی تر نییە .** الآداب الشرعية.] (1/231)

3) المرداوي فەرموویەتی:

**دار الحـرب بـریتیـیە لەو دارەی کە حـوکـمی کـوفر تیـایـــدا زاڵ دەبـێـت.**

4) **أبو يعلى** فەرموویەتی:

**هەر دارێـک ئەحکـامی کـوفر تیایـدا زاڵ بێـت لەجێگـای ئەحکـامی ئیسـلام ئەوا دار الكفرە.** (المعتمد في أصول الدين )

5) **ابن قدامة** لە( المغنى ) فەرموویەتی:

**کەی خەڵکـی شـارێک هەڵـگەڕانەوە وە ئەحکـامی ئەوانـی تیـادا پەیـڕەو کـرا ئەوا بـووەتە دار حـرب لە بە غەنـیمەت گرتنـی ماڵیـان و بردنـی منـداڵ و ئافرەتیـان**

**ئەمەش لەدوای ڕیددە ڕوویانداوە وە لەسەر ئیمامی موسلمانانە جەنگ کردن لەگەڵیان.**

## وەڵامیش لەسەر ئەمە ئەوەیە کە دەگوترێت:

**یەکەم :** ئەم زانایانە قسەیان دەربارەی زاڵبوونی حوکم کردنەکە کردووە لە دارەکە نەوەک زاڵبوونی خەڵک ، هەتاوەکو ئەوکاتە ناوی دارەکە ئەدەن کاتێک کە لەڕووی حوکمەوە زاڵ بووە ، کەچی ئێوەش قسەکانی ئەوانتان کردووەتە دەربارەی حوکم دان بەسەر خەڵکی وە قسەی ئەوان دەربارەی خەڵکەوە لەدوای ئەمەوە دێت کە ئەوان لەسەر ئەمە پێچەوانەتانن ، وە سا فەزح و ڕیسواش دەبن کە ئێوە سەرەڕای جەهلەکەشتان فێڵ و چەواشەش دەکەن.

**دووەم :** هیچ دەلیل و بەڵگەیەک لەمەدا نییە لە حوکم دان بەسەر موسلمانێک کە نوێژ دەکات وە هیچ هەڵوەشێنەرەوەیەکیش لێی بەدەر نەکەوتووە جگە لەوەش زانیاریمان هەیە لەسەر ئیسلامەتیەکەی و نوێژ کردنەکەی ، بەڵکو ئەوپەڕی ئەوەی کە تیایەتی ئەوەیە کە کەسی مەجهول کە بە ئیسلامەتیەکەی نەزانراوە وە هیچ نیشانەیەکی ئیسلامەتیشی لێ بەدەر نەکەوتووە لە دار کفر محاربةیە ئەوا حوکمی ئەهلەکەی وەردەگرێت ، وە ئەمەش بابەتەکەی ئێمە نییە کە لە دەرەوەی شوێنی نیزاعە.

**سێیەم :** ئەو فوقەهایانە لەوانەی کە ئەم قسانەیان کردووە هەر خۆیان نەقڵیان کردووە کە هەر کەسێک لە دار الحرب بینرا نوێژی دەکرد ئەوا حوکمیان داوە بە ئیسلامەتیەکەی لە ڕووکەشدا ، جا ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو خەواریجانە ئەهلی هەواو ئارەزوون تەنها ئەو شتانە دەنوسن

که لەگەڵیان دەگونجێ وە وازیش دەهێنن لەو شتانەی کە بەڵگەیە لەسەریان ، جا سەیربکە بۆ نموونە ئەو قسانەی کە ئەو زانایانە فەرموویانە نەقلی دەکەن کە دەربارەی خۆیانە بەڵام ئێمە نا بەڵکو ئێمە لە وەحی و ئەثەر و پێشەوایانی حەدیث وەردەگرین ، وە ئەوانیش هەر شتێک لەگەڵ هەواو ئارەزوویان بێت ئەوە هەڵدەبژێرن هەروەک ئەوەی لە پێشەوەدا باسکرا لە قسەی زانایان لە حوکمدان لەسەر خەڵکی بەپێی دارەکە کەوا زەعیفە هیچ یەکێک لەوان باسی ئەمە ناکات ، جا بەمە دەزانیت کە ئەوانە شوێنی هەواو ئارەزوویان کەوتوون.!!

# گومانی چوارەم :

**بەڵگە دەهێننەوە بە قاعیدەی استصحاب لەکاتێکدا ئەمە زەعیفە!**

وە ئا ئەمانەش ووتەی ئەوانەیە کە بەڵگەی پێیان دەهێننەوە لە دینەکەیاندا:

**إبـــن الـــقيـــم** دەفــەرمــوێــت: **وە شـتێکی زانـراوە کە شـایەتی دانـی پیـاوێکی عەدل یـان ئـافرەتێکی عەدل زۆر بەهێزتـرە لە استصـحاب چــونکە استصـحاب لە لاوازترینی بــەڵگەکانە.** ( إعلام الموقعين )

**ابـن الأنبــاری** دەفــەرمـوێــت: **استصحاب لە لاوازترینی بەڵگەکانە.**

( كما في كتاب الاعتراضات النحوية في منار الوقف و الابتداء )

**ابــن تـيــمــية** دەفــەرمــوێت: **دەسـتگرتن بە تەنهـا استصـحاب لەکـاتی نەبوونی لاوازترینی بەڵگەیە بە موتڵەقی.** مجموع الفتاوی[(23/15)

وە **شــەوکانی** فەرمـوویەتی: **نـاگەڕێینەوە بـۆ استصـحاب تەنهـا دوای ئەوەی کە بەڵگەیەکـمان نەبێـت لە قورئـان ، پاشـان بەڵگەیەکـمان نەبێـت لە سـوننەت ، پاشــان بەڵگەیەکـمان نەبێـت لە قیـاس ، لەوکاتــدا تەنهـا کـاردەکەین بە استصـحاب ! وە ئەمەش نهێنـی لاوازی حـوکم دانە بەپێـی حـوکمی دارەکە لە بوونی کارکردن بە استصحاب!**

## وەڵام : دەڵێم:

ئەمە ووتەی ئەوانەیە کە هەرخۆیــان قســەکانیان نەقـل دەکەن ، وە هەر ئەوانـیش بەڵـگە بەو زانایـانە دەهێـنـنەوە ، جـا ئەگەر ئەمە تنـاقض بێـت لەلایەن ئەو زانایـانە لەگەڵیـان ئەوا هەنـدێکیان بە هەنـدێکی تـر شـوبهە و گومانەکانیـان هەڵدەوەشـێنێتەوە ، قسـەی ئەمـانە کە وەرگیـراوە لێیـان پـێچەوانەیە لەگەڵیـان ،

ئەگینـا ئەوانەشــی کە بەڵـگە بەم زانایـانە دەهێنـنەوە هەموویـان کەســی مسـتور لە دار الکفـر کـافر نـاکەن وە ئەوانـیش چـاک ئەمە دەزانـن ، والحاصـل کردنــی ئەحکـامی حـوکم دان بە پێـی دارەکە بە منـاط ــێک بـۆ کـوفری قەتعــی و ئیمانــی قەتعــی ئەوە گەورەتـرین بەڵـگەیە لەسـەر جەهلـی ئەم کـۆمەڵەیە بە حەقیقەتـی ئیمان و شیرک ، بەڵکو ئەمە لە ئەصل ـدا جەهلە بە أصلی دین.!

# گومانی پێنجەم :

دەڵـێن : **ئەگەر زۆریـنەی خەڵکـی خـاک و وڵاتێـک کـافر و موشریـک بـوون ئەوا ئـــەوەی دەمـــێــنـــێـتـــەوە حوکمـــی زۆرینــــەکــە وەردەگــــــــرێت!!**

**وەڵام : دەڵێم:**

**یەکەم :** واز لە کەســی مەجهــول دەهێنــین ، بەڵام موســلمانێکی مەســتور بـــۆچی ، واتە شــــەهادەی هێنـــاوە و نــــوێژی کــــردووە وە هـــیچ هەڵوەشێنەرەوەیەکیشــی لــێ بەدەر نەکەوتــووە ؟؟ چــۆن گەیانــدتانە نێــو کــوفرەوە بەبێ هیچ هەڵوەشێنەرەوەیەک ؟؟؟

**دووەم :** کـێ ئەم قاعیـدە بـاطلەی دانـاوە لە شـەریعەتدا لە حـوکم دان بەسـەر خەڵکیدا بە کوفر ؟ لــە کوێـــیـــــتە بەڵگــەی ئەمە لە وەحـــی و ئــەثەردا ؟...

**سـێیەم :** وە لە پێشــووتردا ژمــارەیەک نەصــی ڕوونمــان باســکرد لەســەر وەڵامـدانەوەی ئەم بـاوەڕە بــاطلەی خەواریجەکـان ، لەوانـیش ئەو ئـایەتە کە هــیچ کەس نکـۆڵی لــێ ناکـات تەنها کەسـێکی ضـال و مضـل نەبێـت ، لەم ووتەیەی اللــە تعــالی کە فەرمـوویەتی : ( **لا تقـولـوا لمـن ألقـى إلـيكم السـلام لست مؤمنا .... فتبينوا )**

**واتە :** کاتێـک کەوا ئێـوە دەگەن بە کەسـێک کە سـەلامی موسـلمانانەتان لــێ دەکـات مەڵـێن ئیمانـدار نیـت ... بەڵکـو لە هەمـوو شـتێکدا تبـین بـکەن و ڕوونــی بکەنەوە..

وه باسمانکرد کەوا وارید بووه هەرکەسێک لە دار الحرب ـدا نیشانەیەک لەسەر ئیسلامەتیەکەی داربخات ئەوا نە کافر دەکرێت وە نە دەکوژرێت بەڵکو وازی لێ دەهێنرێت وە ئەم ڕووکەشیەی لێ قبول دەکرێت ، **جا حوکمی ئەغلەبی و زۆرینە لەکوێی ئێرەدا هەیە ؟** وە هەروەها ئەمە قاعیدەیەکی فقهیە تەنانەت لەلای زانایانیش ئەمە پاڵنەر نەبووە ، وە هەندێکیان فەرموویانە کە بەڵگەیان پێ هێناوەتەوە وەک **القرافي** لە الفروق ـدا فەرموویەتی: ( شەرع غالب و زۆرینە ) هەڵدەوەشێنێتەوە وەک ڕەحمەتێک بۆ بەندەکان. وە دوو قسم ـیشی باسکردووە : قسم ـێک کەمینە اعتباری بۆ دەکرێت ، وە قسم ـێکیش تیایدا بەیەکەوە هەڵدەوەشێنەوە. وە لەسەر هەر قسم ـێکیش **بیست** نموونەی باسکردووە.

گوتوویەتی :

قسم ـی یەکەم : ئەوەیە کە تیایدا زۆرینە هەڵدەوەشێتەوە ، وە کەمینە پێشدەخسترێت بەسەریدا ، وە حوکمەکەی جێگیردەکات لەجێگای ئەو ، وەک ڕەحمەتێک بۆ بەندەکان ، وە لەویش بریتییە لە نموونەی سێیەم : **داواکردنی شەرعە بۆ نیکاح کردن بۆ وەچە نانەوە** ، لەگەڵ ئەوەی کە زۆرینەش لەو منداڵانە **جاهیل و نەفامن** بە تەوحیدی اللە تعالی ، وە هەوڵ دانە بۆ سەرپێچی.

وە مقتضی ـی ئەمەش : ئەوەیە کە نەهی بکرێت لە وەچە نانەوە لەبەر زاڵ بوونی فەساد لێیان ، جا لێرەدا **شەرع حوکمی زۆرینە هەڵدەوەشێنێتەوە** ، وە اعتبار دەکاتە سەر **حوکمی کەمینە** ، **ترجیح ـێکە بۆ کەمی ئیماندارا**ن بەسەر **زۆری کوفر و سەرپێچی**.

پاشـان باسـی قسـمی دووەم دەکـات : کە ئەویـش **هەڵوەشـاندنەوەی زۆرینـە و کەمیـنەیە** بەیەکەوە ، وە لەویـش بـریتییە لە **نمـوونەی پێـنجەم :** شـایەتی دانـی سـێ کەسـی عەدلە لە زینـادا : جـا لێـرەدا **زۆرینەیـان ڕاسـتگۆن** ، بەڵام شـەرع حـوکم بەمە ناکـات سـترێکە لەسـەر تاوانبـار کـراو ، وە لە هەمـان کاتـدا حـوکم نادرێـت بە درۆکردنیـان ، بەڵام حەد جێبەجـێ دەکـرێ بەسـەریان ، لەڕووی ئەوەی کە ئەوان ئەو کەسـەیان تۆمەتبـار کـردووە ، نەوەک لەڕووی ئەوەی کە شایەتی بە درۆیان دابێت. )

جـا دەڵـێم : ئەم قاعیـدەیە سـەلەف بەکاریـان نەهێنـاوە لە تەکفیـر کردنـی خەڵکیـدا تەنها لە موڕتەدەکـان نەبیـت لە ڕیـدەی گشـتیدا بە گشـت تاکەکـانەوە بە تێکڕایـی وەک بەنـی حەنیفە لە سـەردەمی موسـەیلەمە ، نەوەک لە هەمـوو جۆرەکـانی خەڵکـی لە **دار الکفـر قەطعیـاً** سـەرەڕای ئەوەش کە هەرکەسـێک ئیسـلامەتی دەربـخات و نواقـضێک لێـی سـەرهەڵنەدابێت لە مەسـتورەکان

# گومانی شەشەم :

**بەڵگە بە بەسەرهاتەکەی عەباس دەهێننەوە کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم حوکمی کوفری ـدا بەسەری ، بە حوکم دان بە پێی دارەکە... !!**

## وەڵام:

بەڵگە هێنانەوە بەمە باطل ـە ، وە بە تەنها بە باسکردنی بەسەرهاتەکە دەزانیت کە ئەمە بەڵگەیە لەسەریان: عَنِ ابْنِ عَبَّاس قَالَ : كَانَ الَّذِي أَسَرَ الْعَبَّاسَ أَبُو الْيَسَرِ ـ كَعْبُ بْنُ عَمْرو وَكَانَ أَبُو الْيَسَرِ ـ رَجُلًا مَجْمُوعًا وَكَانَ الْعَبَّاسُ رَجُلًا جَسِيمًا فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِلْعَبَّاسِ : يَا عَبَّاسُ افْدِ نَفْسَكَ وَابْنَيْ أَخِيكَ عَقِيلَ بْنَ أَبِي طَالِب وَنَوْفَلَ بْنَ الْحَارِثِ وَحَلِيفَكَ عُتْبَةَ بْنَ جَحْدَمٍ أَخَا أَبِي الْحَارِثِ بْنِ فِهْرٍ ، فَإِنَّكَ ذُو مَالٍ قَالَ :يَا رَسُولَ اللَّهِ ، إِنِّي كُنْتُ مُسْلِمًا وَلَكِنَّ الْقَوْمَ اسْتَكْرَهُونِي قَالَ » : اللَّهُ أَعْلَمُ بِإِسْلَامِكَ ، إِنْ يَكُ مَا تَقُولُ حَقًّا فَاللَّهُ يَجْزِيكَ بِهِ ، فَأَمَّا ظَاهِرُكَ فَكَانَ عَلَيْنَا ، فَافْدِ نَفْسَكَ «

واتە : ابن عەباس گوتی : ئەی سول الله ، من موسلمان بوومە بەڵام قەومەکەم إكراه و زۆریان لێ کردم ، پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم، فەرمووی : الله زاناترە بە ئیسلامەتیەکەت ، ئەگەر ئەوەی دەیڵێت بەم شێوەیە بێت ئەوا الله پاداشتت ئەداتەوە ، بەڵام ڕووکەشی تۆ لەسەر ئێمەیە ، جا فیدیە بدە و خۆت ئازاد بکە.

منـــيش دەڵـــێم : عەبـــاس هەر لە بنچیـــنەدا ئیســـلامەتیەکەی خـــۆی دەرنەخستبوو ، وە لەگەڵ کـافرانیش دەرچووبـوو بە زۆر لێکـردن بـۆ شـەڕکردن دژی موسـلمانان ، جـا حجـجە و بەڵـگەی ئەمە لە کـوێیە ئەی مـدلیس و چەواشەکارەکان !!

وە **ئەوزاعی** رەحمەتی الله لێی بێت فەرموویەتی:

مەککە دار الحـرب بـوو رسـول اللـه صلی الله علیه وسلم و موسـلمانان زاڵ بـوون بەسـەریا ، وە پیـاوانێکی موسلمانیشـی تێـدا بـوو ، جـا رسـول اللـه صلی الله علیه وسلم هـیچ خـاک و زەوی و ئـافرەتێکی زەوت نەکـرد لێیـان ، وە خەڵـکەکەش ئیمانیـان هێنا وە لێشیان خۆش بوو. (الرد على سير الأوزاعي ص ( 128 )

# گومانی حەوتەم :

**خەواریجەکان دەڵێن : جیاوازی هەیە لەنێوان حوکمدان بە ئیسلامەتی و نوێژکردن لە سەردەمی پێغەمبەرایەتی و سەردەمی سەلەفدا وە لەنێوان سەردەمی ئەمڕۆکەماندا ، اعتبار ناکرێت بە شەهادە هێنان و نوێژ کردن لەم سەردەمەی ئێمەدا لەبەر زۆری بەربڵاوی شیرکەوە ؟؟!**

## وەڵام:

سبحان اللە !!! لێرەدا دەبینیت کە خەواریجەکان کەوتوونەتە ناو ئەو شتەی کە عەلمانیەکان تێی کەوتوون ، ئەو عەلمانیانەی کە دەڵێن : **نەصەکانی شەریعەتی ئیسلامی بۆ ئەم سەردەمە گونجاو نییە و بە کەڵک نایەت** !! یان لەو شتانەشی کە دیموکراسیەکان تێی کەوتوون ئەوەیە کە دەڵێن : شەریعەت بە کەڵک نایەت حوکمی پێ بکرێت چونکە سەردەمەکە گۆڕاوە بۆیە پێویستی بە گۆڕانکاری و جیاوازیەکی نوێ هەیە... !!!!

**یەکەم :** کێ قسەی لەبارەی ئەم جیاوازیەوە کردووە ، وە بەڵگەی ئەمە لە کوێیە لە وەحی و ئەثەردا لە نەصە ڕاشکاو و ڕوونەکان ، بۆیە هیچ شتێک لەم بارەیەوە نادۆزیەوە جا باوەڕیان پێ مەکەن و شوێنیان مەکەون بەهۆی تەحریف و گۆڕین و شێواندنی موشتەبیهاتەکان بۆ هەڵوەشاندنەوەی موحکەماتەکان.

**دووەم :** بنچینەکانی دین و قاعدەکانی کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دایمەزراندووە گونجاوە و شیاوە بۆ هەموو سەردەم و شوێنێک **تاکو قیامەت** ، گۆڕانکاری و تایبەتکردن و خۆبەستنەوە **قبوڵ ناکات** ، بە تایبەتی ئەوانەی

که قسـه به ڕاو بۆچـوونی خۆیـان دەکەن نەوەک به وەحـی و حـوججە ، سـەرەڕای تـایبەت کـردنەکەی ئێـوە بـۆ دەرەوەیە ئەفکـارە بۆگەنەکەتـان !! جـا اللـە عـز وجـل زانـایە و دەزانێـت بەم گۆڕانکاریـانەی کە ڕوودەدات لە سـەردەمەکاندا جـا ئەو بنچینـە و قاعـدانەی کە بـۆ ئیسـلام دانـراوە ثابـت و جێگیـرە بـۆ هەمـوو ئەم گۆڕانکـاری و جیاوازیـانە ، جـا بنچینـەی مـامەڵە کـردن بە ظـاهر و ڕووکەش گۆڕانکـاری و تەبـدیل قبـوڵ ناکـات ، وە لەبەر ئەمەش ، بێگومـان شـەریعەت خـاوەنی ئەو هێـز و توانـایەیە کە هەمـوو نـوێ بـوونەوەیەک لەخـۆی دەگرێـت ، لە بەباش دانراو و بە خراپ دانراو...

**الله تعالى** دەفەرموێت : ( أَلا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ )

**واتە :** ئایـا ئەو اللـە ــیەی کە مەردوومـی دروسـت کـردووە ئاگـای لە نهێنییـان نییـە لە کاتێکـدا کە ئەو وردبـین و ئاگـادارە. وە هەروەهـا دەفەرموێـت: ( وَمَـا كَـانَ رَبُّكَ نَسِيًّا ) **واتە :** وە پەروەردگارت کردەوەی بەندەکانی لە بیر نەکردووە.

وە هەروەهـا اللـە تعـالى دەفەرموێـت : ( الْيَـوْمَ أَكْمَلْـتُ لَكُـمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَـيْكُمْ نِعْمَتِـي وَرَضِـيتُ لَكُـمُ الإِسْـلامَ دِينًـا ) **واتە :** ئەمـڕۆ ئایینەکەتـانم تەواو کامـڵ کـردووە بۆتـان و چـاکە و بەهـرەی خـۆم بە تەواوی ڕشـتووە بەسـەرتاندا و ڕازی بـووم کە ئیسـلام ئایینتـان بێـت. وە پێغەمـبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: مـن دوو شـتم بـۆ جێهێشـتوون کە ئەگەر دەسـتی پێـوە بگـرن لەدوای مـنەوە هەرگیز گومڕا نابن ، ئەویش کتێبەکەی اللە و سوننەتەکەمە.

وە **هەروەهـا دەفەرموێـت :** نموونـەی مـن و نموونـەی پێغـەمبـەرانـی پـێش مـن وە کـە نمونـەی ئـەو پیـاوە وایـە کـە خانوویـەک دروسـت دەکـات ، و پاشـان زۆر بـە جوانی ڕێک و پێکی دەکـات جگـە لـە جێگـای خشـتێک نـەبێـت لـە گۆشـەیـەکـی ئـە

و خانووە نەبێت ، خەڵکی دێن و دەڕۆن بەچوار دەوریدا دەسوڕێنەوە و زۆر سەرسام دەبن بەجوانی ئەو خانووە و دەڵێن : ئای حۆزگە جێگای ئەو خشتەش پڕ دەبویەوە ؟ پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم فەرمووی : من ئەو خشتەم و من خاتم الانبیاء و کۆتا پێغەمبەرم.

وە هەروەها پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم دەفەرموێت : پێنج شتم پێدراوە کە بە هیچ کەسێك نەدراوە لە پێش مندا : بە ئەندازەی یەک مانگەڕێ ترساندن سەرخراوم ، وە هەموو سەر زەویم بۆ پاککراوەتەوە و کراوە بە مزگەوت ، هەرکەسێک لە ئوممەتەکەم کاتی نوێژی بوو با یەکسەر نوێژەکەی بکات ، وە غەنیمەتم بۆ حەڵاڵ کراوە و بۆ هیچ کەسێک لە پێش مندا حەڵاڵ نەکراوە ، وە شەفاعەتم پێدراوە ، وە هەموو پێغەمبەرێک بە تایبەتی بۆ گەلەکەی خۆی نێردراوە ، من بۆ هەموو خەڵکی نێردراوم.

بەڵام **خەواریجەکان** بە زمان حاڵیان دەڵێن : ئەگەر دەستمان گرت بەم نەصانە لەم سەردەمەدا گومڕا دەبین ، لەبەرئەوەی سەردەمەکە گۆڕاوە !!

**محمدی کوڕی إبراهیم** دەفەرموێت : دینی ئیسلام خێر و چاکە و صلاح ـی دونیایی و قیامەتی هێناوە ، کە گونجاوە و شیاوە بۆ هەموو سەردەم و شوێنێک. (فتاوى بن إبراهيم (6/45)

بۆیە بەهەمان شێوە هەروەکو چۆن لە پێشتر حوکمیان بە شەعائیرەکانی ئیسلام داوە کە لە هەموو کاتێکیش بەهەمان شێوە کوفر و شیرک بڵاوبووە ، ئەوا لەم سەردەمەش حوکم بە شەعائیر ئەدەین و دینی ئیسلام وەک خۆی جێبەجێ دەکەین ، نەوەک بەو شێوەیەی کە ئێمە پێمان خۆشە ...!!!

# گومانی هەشتەم :

**دەڵێن : خەڵکی یان ئیمانداره وه یان کافره ، هەروەکو چۆن الله تعالی فەرموویەتی: ( هو الذي خلقكم فمنكم كافر ومنكم مؤمن ) واته : هەر ئەو الله ـیەیە کە ئێوەی درووستکردووە ئینجا هەندێکتان بێ باوەڕ و هەندێکی تریشتان باوەڕدارن.**

بەهەمان شێوەش شەعب و گەلەکان لەمڕۆکەدا لەم دوو جۆرە دەرناچن ، جا ئەگەر ئەغلەب و زۆرینە کافر بێت ئەوا موسلمانەکانیش پەیوەست دەبن بەوانەوە و حسابی کافرانیان بۆ دەکرێت لەبەر کەمیەکەیان !! وە لە سەیرو سەمەرەکانی ئەو شوبهەیە ئەوەیە کە مورجیئە و خەواریجەکان هەردووکیان بەڵگە بەمە دەهێننەوە !!

**وەڵام:**

ئەی فاسق و مونافیقەکان لە کامە خانەی دادەنێن ؟؟ جا لێرە چاک دەشڵەژێن !! جا فاسق و مونافیقەکان نە لە ئیماندارانن وە نە لە کافرانیشن ! بەو مانایەی کە جۆرەکەیان جیاوازە لەگەڵ ئیماندار و کافر ( وە ئەم هەڵەیەشیان ڕوون دەبێتەوە لە تێگەیشتنیان لەم ئایەتەی کە لە سەرەتادا باسکرا.

**الخلال** ڕیوایەتی کردووە لە( السنة 967 ) :

**سلیمان ـی کوڕی الأشعث** بۆی گێڕاینەوە و گووتی : گوێم لە **ئیمامی أحمد** بوو کە پیاوێک پێی گووت : پێم بڵێ ئایا تۆ ئیمانداری ؟ گوتم : بەڵێ ، ئایا شتێک هەیە لەمە بەرزتر بێت ؟ ئایا خەڵکی تەنها ئیماندار و کافر نینە ؟

**ئیمامی أحمد** زۆر تورە بوو ، وە فەرمووی : ئەمە قسەی مورجیئەکانە ، **الله عز وجل** فەرموویەتی : ( وَآخَرُونَ مُرْجَوْنَ لِأَمْرِ اللَّهِ )

دەڵێم : کەواتە خەواریجەکان لەگەڵ ئەمەش کەوتوونەتە ناو ئیرجائەوە هەروەکو ئەمەش عادەتیانە !!

**أبو الحسين الملطي** فەرموویەتی لە کتێبەکەی( التنبيه والرد على أهل الأهواء ) (50 - 47) وەک ئەوەی کە وەڵامی ئەم شوبهەیە بداتەوە کە موناقەشە لەگەڵ خەواریجەکانی کۆن دەکات کاتێک بەڵگەیان بەمە هێناوەتەوە :

وە **پێیانی فەرموو** لە تەکفیر کردنی خەڵکیدا : **بۆچی کەسێک کافر دەکەن کە دانی ناوە بە الله و پێغەمبەرەکەی و دینەکەی بەڵام لەگەڵ ئەمەدا گوناهێکی گەورەی ئەنجام داوە ؟** جا گوتیان : ئەمە قیاسە لەسەر ئەم ووتەیەی الله عز وجل کە فەرموویەتی : ( وَمَنْ يَكْفُرْ بِالْإِيمَانِ فَقَدْ حَبِطَ عَمَلُهُ ) پاشان الله عز وجل فەرموویەتی : ( إِنَّا هَدَيْنَاهُ السَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا ) وە فەرموویەتی : ( هُوَ الَّذِي خَلَقَكُمْ فَمِنْكُمْ كَافِرٌ وَمِنْكُمْ مُؤْمِنٌ ) جا الله تعالى لەنێوان کوفر و ئیماندا **پلەی سێیەمی دانەناوە** ، وە هەرکەسێک کوفری کرد و کردەوەی هەڵوەشایەوە ئەوا ئەو کەسە موشریکە ، وە ئیمانیش لوتکەی کردەوەکانە ، وە یەکەمی فەرزەکانە لە کردەوەدا ، وە هەرکەسێک وازی لەوە هێنا کە الله فەرمانی پێ کردووە ئەوا کردەوەکان و ئیمانی هەڵوەشاوەتەوە وە هەرکەسێکیش کردەوەکانی هەڵوەشایەوە ئەوا ئەو کەسە بێ ئیمانە ، وە ئەو کەسەشی ئیمانی نەبێت ئەوا موشریک و کافرە ، **ئەویش پێیانی فەرموو :** هەڵەتان کردووە لەم قیاس کردنە و وازتان هێناوە لە ڕێگای عیلم ، وە ئەمەش الله عز وجل ڕوونی کردووەتەوە لە کتێبەکەی کە فاسق مەنزیلەیەکە لەنێوان ئیمان و کوفردا ،

به بەڵگەی ئەم **ووتەیەی** کە فەرموویەتی :

( وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَدًا وَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ )

وە **نەیفەرمووە** : ئەوان لەگەڵ فسق ـەکەیان ئیمانـدارن هەروەکـو ئەوەی کە مورجیئەکـان دەیڵـێن ، وە نەیفەرمـووە ئەوان لەگەڵ فسـق ـەکەیان کـافرن هەروەکـو ئەوەی کە ئێـوە دەیڵـێن ، تەنهـا نـاوی فسـق ـی بۆیـان چەسـپاندووە ، جـا ئەوان فاسـقن نە ئیمانـدارن و نە کـافرن هەروەکـو چۆن اللـه عـز وجـل فەرمـوویەتی : وە ئـومەت ئیجماعیـان لەسـەر ئەمە هەیە ، وە ئـومەت یەکـدەنگن لەسـەر نـاوی فسـق بـۆ ئەهلـی کەبـائیر و ئەوانەی تـاوانە گەورەکـان ئەنجـام دەدەن ، وە ئەمەش نـاو و مەنـزیلەیەکە لەنێـوان کـوفر و ئیمانـدا لەسـەر ئەمەش ئومەت ئیجماعیان هەیە.

# گومانی نۆیەم :

**بەڵگە دەهێننەوە بە باسەکەی مجاعە لە بێدەنگ بوونی لە موسەیلەمە وە تەکفیر کردنی لەلایەن خالیدی کوڕی ولیدەوە بەهۆی ئەم بێ دەنگ بوونەیەوە !!**

**وەڵاممان** لەسەر ئەمە ئەوەیە کە دەگوترێت :

ئەم بەسەرهاتە بەم لەفزە باطل ــە وە تەنها بڵاوبووەیەکی خورافیات و هەڵبەستراو و بێ بنەمایە و بەس.

**ابن سعد** لە ( طبقات ) (9341) دەفەرموێت :

**محمدی کوڕی عمر** پێی وتین ، وتی هیشامی کوڕی سعد پێی وتین لە **دەخیلی** کوڕی **برای مەجاعەی** کوڕی مورارە لە باوکیەوە وتی : کاتێک **خالیدی کوڕی ولید** دابەزی لە العرض مەبەستی ئەوەبوو بڕواتە یەمامە ، ئەسپێکی هێنا لەسەروەی 200 کەسی دانا ، وە وتی کێتان دیت لە خەڵکی بیگرن ، بەڕێکەوتن ، **موجاعەی کوڕی موراڕەی حەنفی** یان برد لەگەڵ 23 پیاو لە قەومەکەی ، چون بۆ داوای پیاوێک لە قەومی نومەیر ، موجاعە پرسیاری کرد وتی : واللە خزمی موسیلەمە نیم ، وە چومە لای **پێغەمبەر** صلی اللە علیە وسلم مسوڵمان بوم و نەشگۆڕاوم ، و دینەکەم نەگۆڕیوە ، **خالد** هاتە لای قەومەکە لە ملی دان ، وازی لە موجاعە هێنا و نەیکوشت ، کەسێکی شەریف بوو ناو قەومەکەی پێیان دەوت : **موجاعەی یەمامە** ، **ساریەی کوڕی عەمر** بە **خالیدی کوڕی ولیدی** وت : گەر شتێکت هەبوو لەلای خەڵکی

یەمامە ، واز لەوە بێنە موجاعە کوڕی مرارە نەیکوشت لەپێش خەڵکەک بەستیەوە لە ئاسن ، پاشان بردیان بۆلای خێزانەکەی دایکی تەمیم ، جا پاراستی لە کوشتن ، موزاعەش پاراسترا بەهۆی خێزانەکەی ، تاکو سەردەکەون بەسەر قەومی حەنیفە ، ئینجا هاوپەیمانیان کرد لەسەر ئەوە.

وە **خالید** داوای دەکرد و قسەشی لەگەڵ دەکرد وە پرسیاریشی لێ دەکرد دەربارەی بارودۆخی یەمامە وە بارودۆخی عەشیرەتی حەنیفە و موسەیلەمە جا موجاعەش لەوەڵامدا دەیوت : واللە من بەدوای موسەیلمەوە نەکەوتووم وە من مسوڵمانم ، **خالید** وتی : دەی بۆچی دەرنەچووی و نەهاتی بۆلام ، یاخود هەر قسەیەکت کردبوا وەکو ئەوەی کە ثومامەی کوڕی اثال کردی ، ئەویش وتی : ئەگەر پێت وایە کە خۆش بیت لە هەموویان ئەوا ئەم کارە بکە ، وتی باشە کارەکە دەکەم ، ئەوەش بوو کەوا سوڵحی **خالیدی کوڕی وەلیدی** کرد لە یەمامە وە ئەوەی تیایەتی پاش کوشتنی موسەیلەمە وە خالیدی کوڕی وەلید هێنای بۆ لای ابو بکری صدیق ، وە باسی ئیسلام کردنەکەی کرد وە ئەو شتەی لەگەڵی بوو لێی ابو بکر لێی خۆش بوو وە متمانەشی پێکرد ، وە بۆ ئەو و بۆ وەفدەکەشی نوسی کەوا ئەوان ئەمانن وە بۆ وڵاتی خۆیانی گەڕاندەوە بۆ یەمامە . وە ئەو گومان و شوبهەیەی کە خەواریجەکان هەیانە کە وەکو بەڵگە هێناویانەتەوە لە مختصر السیرة ی محمدی کوڕی عبدالوهاب ، ڕیوایەت کراوە لێی کە قسەی خالیدی کوڕی وەلیدی تێدایە : ئەی مجاعە ئەوە ئەمڕۆکە وازم لێهێنای کە دوێنێ لەسەری بووی ، وە ڕازی بوویت بەو کارەی کە ئەم درۆزنە کردی ، وە بێدەنگ بوونت لەسەر ئەمە ، وە تۆ لە خۆشەویسترینی خەڵکی یەمامەی کە اقرارت پێی کرد وە ڕازیبوویت بەوەی پێی هات ئەم درۆزنە ، جا ئایە بۆچی عوزرت بۆ نەهێناین ، قسەت

کردبوا لەسەر ئەوانەی کە ئەو قسانەیان دەکرد ؟ ئەوجا **ثومامە** وەڵامی داوە و نکۆڵی لێی کرد.

**دەڵێم :** دەردەکەوێت کە **محمدی کوڕی عبد الوهاب** ، ئەمەی نەقڵ کردووە لە حافظەکەی خۆی ، جا لە بەسەرهاتەکەدا زیادی و کەمی تێدا هەیە لە سەرچاوە ئەصلیەکەی خۆی ، وە ئەمە هیچ ئەصلێکی نییە لە کتێبەکانی سیرە و تاریخ. !!

وە لەم ڕیوایەتەدا لە کتێبی الردة ـی واقدي (1/118) تێیدا هاتووە :

جا گووتی پیاوێک پێی دەگوترا **سارِیەی کوڕی عامر** : ئەی باوکی سلێمان ، بەڵام من هەرگیز ئەمەم نەگوتووە ( **خالید** ـیش گووتی ) : ئەی مجاعە ، تۆ چی دەڵێی لەوەی کە ئەم هاوڕێیانەت دەیڵێن ( **مجاعە**ش گووتی ) : من دەڵێم چووم بۆ مەدینە وە رسول الله صلی الله علیه وسلم لە وێ بوو ، ئینجا منیش ئیمانم پێی هێنا ، وە بەڕاستم دانا من و ئەم هاوڕێیەم سارِیەی کوڕی عامر بەیەکەوە بووین ، جا واللە ـی ئێمە نەگۆڕاوین و دینەکەمان نەگۆڕیوە ، جگە لەوە نەبێت کە ناچار بووین موداراتی بکەین لەگەڵ موسەیلەمە لەبەرئەوەی کە ترسمان هەبوو لەسەر خۆمان و ماڵمان و منداڵمان ) **خالید**یش پێی گووت : کەواتە تۆ و هاوڕێکەت بۆ ئەم لایە جودا ببنەوە لەم کافرانە .

**دەڵێم :** ئەم ڕیوایەتەش ئەوەی تیایە کە خالید لێیان خۆش بوو هەتاوەکو سەرزەنشتی کردن بەڵکو دوایش جودایانی کردەوە لەوانی تر وە جگە لەوانیش ناوی کافری لەوانی تر نا ، جا ڕووکەش لەمەدا ئەوەیە کە اعتباری موسلمانی بۆ کردن.

**ابن كثير** له جامع المسانيد والسنن (1644) فەرموویەتی:

مجاعەی كوڕی مراره وه دەگوترێت : سلیم كوڕی زەید كوڕی عبید كوڕی ثعلبة ابن بني يربوع كوڕی ثعلبة كوڕی الدولي كوڕی حنيفة كوڕی لجیم الحنفي اليمامي ، چەندین كاری چاكی كردووه لەگەڵ خالیدی كوڕی وەلید لە جەنگ كردنی قەومەكەی بنی حنیفه لەگەڵ ئەوەش كە خۆشەویستی بۆیان هەبوو وەک ئەو طبع و سرووشتەی كە پیاو هەیەتی بەڵام لەگەڵ ئەوەش ڕقی لێیان دەبوویەوە. وە ئەم ڕیوایەتانە هەژار و كەساسەكان نازانن ئەوانەی كە ڕیوایەتی دەكەن محمدی كوڕی عومەری شیخی ابن سعده كە واقدی **كذابه** جا مەعلومە كە واقدی تۆمەتبار كراوە بە درۆ ، بەڵكو **شافعی** فەرموویەتی : ( **كتێبەكانی هەمووی كذب و درۆیە** ) ، وە المغيرة ــی كوڕی محمدی المهلبی گوتی : گوێم لێبوو كە **علی كوڕی المديني** دەیفەرموو : هیثم ــی كوڕی عدی ثیقه ترە لەلام لە واقدی ، وە ڕازی نیم لێی نە لە وەرگرتنی حدیث وە نە لە ڕەچەلەک و نەسەبی وە نە لە هیچ شتێكی تر .

**النسائي** له ( الضعفاء ) فەرموویەتی : ( ئەو درۆزنانەی كە ناسراون بە درۆ كردن بە دەم **رسول الله** صلى الله عليه وسلم چوارن : واقدی لە مەدینە ، وە مقاتل لە خوراسان ، وە محمدی كوڕی سعيد المصلوب لە شام ، وە باسی چوارەمیشی كرد.

**ابن عدی** فەرموویەتی : ( فەرموودەكانی واقدی **محفوظ** نییە وە بەڵاو و مەینەتیە بۆی.

ابن المديني فەرموویەتی : ( بیست هەزار فەرموودەی لەلایە واتە : هیچ ئەصلێكی نییە ) . وە لە شوێنێكی تر فەرموویەتی : ( ئەو هیچ شوێنی نییە بۆ

ڕیوایەت کردن ، وە ابراهیم ــی کوڕی أبی یحیی درۆزنە ، بەڵام حاڵی ئەو چاکترە لەلام لە واقدی ).

وە **أبو داود** فەرموویەتی:
فەرموودەکانی نانوسمەوە ، وە هیچ قسەیەکیش لەوەوە ناگێڕمەوە ، چونکە هیچ گومانم نییە کە فەرموودە هەڵدەبەستێت.
راجع : تاريخ بغداد (3/3) وتهذيب الكمال (6/600) وتذكرة الحفاظ] (2/425)
وە ئەگەر واش دابنێین کە بەسەرهاتەکەی مجاعە وارید بووە بەبێ اختلاف لە سیاقاتەکانی ، ئەوا لە هەندێک ڕیوایەتدا هاتووە کەوا موسلمان بووە ، وە لەهەندێکی تریشدا هاتووە کەوا ئەو موسەیلەمەی بە ڕاست داناوە و کوفری کردووە کوفری بەواح وە خەڵکی هانداوە لەسەر کوشتنی موسلمانان !! بۆیە لەبەر ئەمە هەرگیز ناکرێت ئەمە بکرێتە بەڵگە ، بەڵام خەواریجەکان باقی سیاقی ئەو ڕیوایەتانە دەشارنەوە و ئەو ڕیوایەتانە دەهێنن کە هیچ ئەصلێکی نییە !!
هەروەها ئەو بەسەرهاتەی **مالک** استدلال پێ کردنەکەیان هەڵدەوەشێنێتەوە ، وە ئەمەش لە چەند ڕوویەکەوە:
**أولاً :** أنه روي عنه أنه منع صدقات قومه.
**ثانياً :** أنه روي عنه ، أنه قال : إني آتي الصلاة دون الزكاة . ثالثاً : أنه روي عنه ، أنه قال لخالد : قد كان صاحبك يقول ذلك ، مرتين . سمع ذلك منه فيما روي ، عبدالله بن عمر ، وأبو قتادة الأنصاري رضي الله عنه .ومع هذا ، فقد كلما خالداً في أمره ، فكره كلامهما ، وقال أسيد بن حضير : قد قتلت

مالك بن نويرة وهو مسلم ، فسكت عنه خالد ، وجزع أبو بكر رضي الله عنه لمقتله ووداه ، وقال عمر لخالد : قتلت امرأ مسلماً.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەو قسەیەی کە کردی لەلای خەواریجەکان بەسە بۆ حوکم بە کوفر بەسەریدا ، هەر بەمە کیفایەتی دەکەن ، ئەوەی کە ووتی " : قد کان صاحبك " دووجاران دووبارەی کردەوە ، بەڵام هاوەڵان پێیان وانەبوو کە ئەمە بەس بێت بۆ حوکم دان بەسەریدا بەمە.

لەبەرئەمەش بەم خەواریجانە دەڵێین : ئەگەر درووست بێت بۆ ئێوە کە بەڵگە بهێننەوە بە بەسەرهاتەکەی مجاعە لەسەر ئەو اختلافەش کە تیایەتی ، ئەوا بۆ غەیری ئێوەش درووستە کە بەڵگە بهێننەوە بە بەسەرهاتەکەی مالک.

وە عەجیب و سەیرە کە بەڵگە دەهێننەوە بە ڕیوایەتی وثیمە لەکاتێکدا ئەم ڕیوایەتە بەڵگەیە لەسەریان !! چونکە ئەوەی کە وثیمەی کوڕی موسی باسی کردووە لە ( کتابی الردة ) قسەکانیان هەر لە بناغەوە کاول و وێران دەکات ، کاتێک باسی کردووە کە مجاعە گەورەی خەڵکی یەمامە بووە لەدوای محکم کوڕی طفیل ، وە هاتە لای پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم موسلمان بوو ، وە بانگەوازی قەومەکەی دەکرد بۆ ئیسلام ، ئینجا ئەوانیش موسلمان بوون هەتا ئەوکاتەی کە موسەیلەمە هەڵیگەڕاندنەوە ، وە ئەو لە ژیرترینی خەڵکی یەمامە بووە و ووتارخوێنی عەرەب بووە ، وە بە عیزەتترینی ئەو قەومە بووە ، جا کاتێک قەومەکەی هەڵگەڕانەوە ، وەک ووتارخوێنێک لەناویاندا هەستایەوە هانیدانەوە بۆ ناو ئیسلامەتی ، وە فێریانی دەکرد کە موسەیلەمە پیاوێکی درۆزنە ، وە چەندین بەیتە شیعری درێژی ئامادە کرد ، جا کاتێک موسەیلەمە گوێی لەمانە بوو بنی حەنیفەی ئامادە کرد بۆ سەری.

**دەڵـێم :** وە ئەمەش ئەو سـوودەی لـێ وەردەگیرێـت کەوا ئەو ئیسـلامەتیەکەی ئاشـکراکردبوو وە پـێچەوانە کـردن و بە خـراپە باسـکردنی موسـەیلەمەی خسـتبووە ڕوو ، جـا چـۆن ئەمە جێگیـر دەبێـت لەگەڵ سەرزەنشـت کردنـی خالید بۆ ئەو ؟!

المهـم بەسـەرهاتەکە هەر لە ئەصـلدا ڕیـوایەتکراوە لە ڕێگـای چەنـد درۆزنێـک وەک واقـدی و سـیف ـــی کـوڕی عمـر وە چەنـدین ڕیـوایەتی تـر هەیە کە حجـجەیە لەسـەریان ، جـا نـازانم چـۆن ئەو خەواریجـانە خۆیـان لە خەت ئەدەن و خۆیان نەزان و نەفام دەکەن لەئاست بەڵگە هێنانەوە بەم ڕیوایەتانە!

# گومانی دەیەم :

**بەڵگە دەهێننەوە بە بەسەرهاتێک کە هیچ ئەصلی نییە بەو لەفزەی کە ئەوان باسی دەکەن ، کە ئەویش بەسەرهاتی پیاوێکی موسلمانە کە بەلای هەندێک موسلمان تێپەڕی لە بەنی حەنیفە لە مزگەوتەکەیان ، لەنێوان مەغریب و عیشادا بوو ، جا لەناویاندا گوێی لە قسەی یەکێکیان بوو ، واتەکەی ئەوە بوو کە : موسەیلەمە لەسەر حەقە ، وە ئەوانیش کۆمەڵێکی زۆر بوون ، بەڵام انکاریان لە قسەکەی نەکرد ، جا ئەم کارەیان گەیاندەوە بە إبن مسعود ، جا استتابەیانی کرد و کوشتنی ، جا دەڵێن هەموو ئەوانەی بێ دەنگ بوون و ئەوەشی کوفرەکەی کرد کوژران ، ئا ئەمەش بەڵگەیە لەسەر تەکفیر عموم!!**

## وەڵام :

أصلی نییە ئەوەی کە ئەوان باسی دەگەن وە لەکوێیە لەفزی بەسەرهاتەکە بە صەحیحی.

**الطبراني** لە ( الكبير 8960 ) فەرموویەتی : **علي كوڕی عبدالعزيز** بۆی گێڕاینەوە ، أبو نعيم بۆی گێڕاینەوە ، المسعودي بۆی گێڕاینەوە لە القاسم ـەوە فەرمووی : عبدالله هات واتە : ابن مسعود ، گوترا پێی : ئەی أبو عبد الرحمن هەندێک لە خەڵکی لەو شوێنە هەنە کە قورئانەکەی موسەیلەمە دەخوێننەوە ، عبدالله ـش لێی دوور کەوتەوە ، ئینجا مایەوە لە شوێنەکەی ئەوەنەی کە الله ویستی لێ بوو بمێنێتەوە پاشان ڕووی تێ کرد و فەرمووی : سوێند بەوەی کە سوێندی پێ دەخۆم ئەی أبو عبد الرحمن بەڕاستی لە ئێستادا وازیان لێ دەهێنی لە خاکەکەیاندا و ئەمەش موصحەفەکەیە کە

لەلایانە ، ئینجا فەرمانی کرد بە قرظة ــی کوڕی کعب ، جا بەو خەڵکەشی کە لەگەڵی بوو ئامادە بوون بۆ ڕۆیشتن ، ئینجا فەرموی : بیانهێنن جا کاتێک ئەوانیان هێنا عبدالله فەرمووی : ئەمە چییە ! لەدوای ئەوەی کە ئیسلام بڵاو بۆتەوە ؟، ئەوانیش گوتیان : ئەی أبو عبد الرحمن داوای لێ خۆشبوون لە الله دەکەین و دەگەڕێینەوە بۆلای ئەو وە شاهێدی دەدەین کە موسەیلەمە درۆزنە و درۆی هەڵبەستووە بەسەر الله و پێغەمبەرەکەی صلی الله علیه وسلم گووتی : ئینجا عبدالله استتابەیانی کرد وە گەڕاندنیەوە بۆ شام وە ئەوان نزیکی هەشتا پیاو دەبوون بەڵام ابن النواحة ڕازی نەبوو کە تەوبە بکات ، ئینجا فەرمانی کرد بە قرظة ــی کوڕی کعب دەریچواند بۆ بازاڕ پاشان لە ملی دا وە فەرمانی کرد کە سەری هەڵبگرێت و فڕێی بداتە نێو ژووری دایکی.

پاشان **عبدالرحمن ــی کوڕی عبدالله** دەفەرموێت : لە دوای ئەمە لەشام بە پیاوێکی بە تەمەن گەیشتم لەو کەسانە و پێی گوتم : ڕەحمەتی الله لە باوکت بێت والله ئەگەر باوکت لەو ڕۆژە ئێمەی کوشتبا ئەوا هەموومان دەچووینە ناو ئاگرەوە.

**دەڵێم :** ئەم خەبەرە ڕیوایەتی کردووە القاسم لە باوکیەوە بە بەڵگەی ئەوەی کە لە شوێنیکی تر باسی کردووە ، کە باوکی باسی کردووە لە سند الحاکم 8960 ، وە إسنادی خەبەرەکەش بەهێزە ، جا باسەکە هەر ئەوە نییە کە یەکێک لەوان قسەکەی کردبێت بە نهێنی و ئەوانی تریش بێ دەنگ بووبن بەڵکو باسەکە ئەوەیە کە ئەوان قورئانەکەی موسەیلەمەیان دەخوێندەوە وە

لە ڕیـوایەتەکەش بە صـیغەی جەمـع هـاتووە جـا مانـاکەی ئەوەیە کە ئەوان هەموویان ئەم کارەیان کردبوو.

وە **أبـو داود** لە سـنـنەکەی ( 2762 ) فەرمـوویەتی : محمـدی کـوڕی کثیـر بـۆی گێـڕاینەوە ، سـوفیان بـۆی گێـڕاینەوە لە أبـو إسـحاق لە حارثـةَ کـوڕی مُضـرِّب کەوا عبداللـه هـاتەوە ئینجـا فەرمـووی : لەنێـوان مـن و لەنێـوان هـیچ یەکێـک لە عەڕەب دوژمنـایەتی و ڕق و قـین نییـه ، بەڵام مـن بەلای مزگەوتێکـی بەنـی حەنـیفەدا تێـپەڕیم جـا ئەوان ئیمانیـان هێنـابوو بە موسـەیلەمە ، جـا عبداللـه ـیان بـۆلا ڕەوان کـرد ، جـا هـات بـۆلایان و پاشـان استـتابەیانی کـرد ، جـگە لە ابن نواحة نەبێت ، عبدالله ـش پێی فەرموو : گوێم لە رسول الله بووە صـلى اللـه علیـه وسـلم ( دەفەرموێـت ) : لـولا أنـك رسـولٌ لضربـتُ عنقـكَ ( جـا تـۆ لەمـڕۆکەدا پێغەمـبەر نیـت ، پاشـان فەرمـانی کـرد بە قرظـةی کـوڕی کعـب ئینجـا لە ملـی دا لەنـاو بـازاڕدا ، پاشـان فەرمـووی : کـێ دەیەوێـت سـەیری ابـن نواحـة بکات بە کوژراوی وا لە بازاڕە.

**دەڵـێم :** لێـرەدا لەم ڕوونکـردنەوەدا بەڵـگەیە کە ئەوان ئیمانیـان هێنـابوو بە موسەیلەمە.

# گومانی یانزەیەم :

بەڵگە دەهێننەوە بەو قسەیەی **محمدی کوڕی عبدالوهاب** کە فەرموویەتی :

**زانایانی هاوەڵان گشتیان یەکدەنگ بوون لەسەر کافریەتی موختار ، سەرەڕای ئەوەی دروشمەکانی ئیسلامی جێبەجێ دەکرد ، بەڵام کاتێک تاوانی بەرامبەر پەیامبەرایەتی ئەنجامدا بەوەی بانگەشەی پەیامبەرایەتی ئەکرد ، هاوەڵان ئەو ئافرەتەیان کوشت کە ڕێگری ئەکرد لە بەکافر دانانی موختار کە لە کچی هاوەڵانیش بوو ، جا چجای ئەوانەی کە دەشتەکیەکان ( البدو ( بە کافر دانانێن سەرەڕای ئەوەی دانیش ئەنێن بەو دۆخە کوفرییەی هەیانە! ؟ ، وە چجای ئەو کەسەی کە ئەڵێت ئەو دەشتەکییانە موسڵمانن ، هەر کەسێک ئەوانە بداتە پاڵ ئیسلام ئەوە کافرە.**

## وەڵام :

**یەکەم :** ئایا دەزانیت حاڵی ( **البدو** ) دەشتەکیەکان چۆن بوو ئەوانەی کە شێخ لەبەرەیان ئەو قسەیەی فەرمووە ؟!

گشت ئەوانەی کە شێخ دەربارەیان قسە دەکات ئینکاریان لە زیندوو بوونەوە دەکرد ، وە جنێویان بە بانگخوێن ئەدا کاتێک گوێیان لێ دەبوو کە بانگ دەدات وە ئەمەش مەشهورە و متواترە لە خەبەرەکانیان تەنانەت کاتێک گوێیان لە بانگ دەبوو بە بانگ خوێنەکەیان دەگووت : ( **علی عمرک** ) **واتە : بمریت و بانگ بدەین بەسەرتدا و ئاسودە بین لێت !!** وە هەروەها زەواجیان نەدەکرد لەگەڵ **کچی بانگخوێن** ، وە دەیانگوت ئافرەت میرات نابات وە گاڵتە و سوکایەتیان بە کەسێک دەکرد کە میراتی دابوایە بە ئافرەت وە اعتباری

ئەوەیان بۆ دەکرد کە ئەو کەسە لە پیاوەتی کەم بۆتەوە !! وە هەرکەسێکیش ئینکاری کردبوا لێیان لە کوشتنی پیاو بەهۆی تاوانی منداڵەکەی ئەوا قسەیان پێ دەگوت و بە پیاویان دانەدەنا و جنێویشیان پێدەدا !!

الشیخ **محمدی کوڕی عبدالوهاب** لە **رسائله الشخصیة لاپەڕە 26** فەرموویەتی : لە هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلامیان تێدایە زیاتر لە سەد هەڵوەشێنەرەوە ، لەکاتێکدا ڕوون بووەتەوە هەموو ئەوانەی کە لە ئایەتەکان دەرکەوتووە ، وە **پێغەمبەریش** صلی الله علیه وسلم ئومەتەکەی فێرکردووە ، وە **زانایان ئیجماعیان** لەسەری هەیە: ( **کە هەرکەسێک ئینکاری لە زیندوو بوونەوە بکات یان گومانی هەبێت لێی ، یان جنێو بدات بە هەرشتێکی شەرع ، یان جنێو بدات بە بانگ دان کاتێک گوێی لێ دەبێ ، یان ئەو شتانەی کە طاغوت سەپاندوویەتی بە چاکتر و پەسەندتری دابنێت بەسەر حوکمی الله ، یان جنێو بەو کەسە بدات کە دەڵێت ئافرەتیش میراث دەبات یان جنێو بدات بەو کەسەی کە دەڵێت مرۆڤ ناکوژرێت بەهۆی تاوانی باوکی و کوڕەکەی ، ئەوە ئەو کەسە کافر و موڕتەدە** ، کەچی زاناکانیشتان دەڵێن : مەعلومە کە ئەمە حاڵی دەشتەکیەکانە ، ئینکاری لێ ناکەین ، بەڵام ئەوان لەگەڵ ئەمەشدا دەڵێن : **لا إله إلا الله** ، کە ئەوەش پاکیان دەکاتەوە لە کوفر ، هەرچەندە هەموو ئەم کارانەش بکەن ، وە مەعلومە کە ئەمانە لە پێشترن و دیارترن لەوەی کە بچنە ناو تەقریرەکانتان ، لەکاتێکیشدا ئەگەر من پێغەمبەرم بەڕاست دانا لەوەی کە پێی هاتووە ، تا توانایان هەیە جنێو و قسەی ناشیرینم پێ دەدەن ، وە دەڵێن من موسلمانان تەکفیر دەکەم و ماڵیان حەلاڵ دەکەم ، وە بۆ خەڵکی ڕوون دەکەنەوە کەوا یەک پیاوی کافر لە جەزیرەکەمان دەست ناکەوێت ، وە دەشتەکیەکان چەندین هەڵوەشێنەرەوە

ئەنجـام دەدەن لەگەڵ بـوونی عیلمیـان کە **دینـی پێغەمـبەر** صـلی اللـه علیـه وسـلم لەلای خەڵکـی شـارە ، وە نکۆڵیـان دەکـرد لە کفریـان ، وە ئێـوەش بیرخۆتـان بهێنـنەوە کە هەرکەسـێک شـتێک ڕەد بکـاتەوە لەوەی **پێغەمـبەر** صـلی اللـه علیـه وسـلم پێی هاتووە لەدوای ناسینی ، ئەوە ئەو کەسە کافرە .

**دووەم :** دەربـارەی **موختـار** وە هەروەهـا ئەمەشـیان لەوەی کە شـێخ نەقڵـی کـردووە لە ذاکرەکەیەتـی وە بـۆ ئەو جـۆرە ڕیـوایەتە بەم شـێوازە بـوونی نیـیە ، جـا ئەو ڕیـوایەتە هەیە لە کتێبەکانـدا بەڵام بەجـگە لەو شـێوازە بـوونی نیـیە ئەویـش ئەمەیە. لە ( **تـاریخ دمشـق** ) هـاتووە : **دوو ئـافرەت لەلای موختـار بـوون** چووبـوونە لای : **یەکێکیـان أم ثابـت ــی کچـی سـمرة کـوڕی جنـدب** ، وە ئەوی تریشیان **عمـرة کچـی الـنعمان ــی کـوڕی بشـیر الأنصـار ي**، جـا مصـعب هەردوو **ئـافرەتەکەی هێنـا لەسـەر بەڕائەت کـردن لە موختـار** ، جـا **کچـی سـمرة** خـۆی **بەری کرد لێی ئەو ڕۆیشت** ، **بەڵام الأنصـار ي ـەکەی کوشت**.
هەروەهـا هـاتووە موصـعەب نـاردی بەدوای ئەو **دوو ئـافرەتە** و پێیـانی گـووت : ئێـوە چـی دەڵـێن لەبـارەی **موختـار** ؟ **أم ثابـت** گـووتی : قسـەیەکم نەکـردووە دەربـارەی ئەو تەنهـا ئەوەی تـۆ دەربـارەی دەڵێیـت ، گووتیـان پێـی : **تـۆ بـڕۆ** ، بەڵام **عمـرة** گـووتی : **ڕەحمەتـی اللـه لێـی بێـت** ئەگەر ئەو بەنـدەیەک بێـت لە **بەندە چاکەکـانی اللـه** ، **مصـعب** ـیش بـردی بـۆ زینـدان ؟ وە نـوسراوێکی نووسـی بـۆ **عبداللـه ــی کـوڕی الزبیـر** ، گـوتی : عمـرة پێـی وایە کە **موختـار پێغەمـبەرە** ، ئەویش نوسراوی بۆ ناردەوە و گوتی : ( **لە زیندان دەریبهێنە و بیکوژە** ).

**دەڵێم :**

جا **ابن الزبیر** ئیقراری کوشتنی ئەوی کرد بە گوێرەی قسەی براکەی **مصعب** کە گووتی ئەو ئافرەتە دەڵێت : ( موختار پێغەمبەرە ) جا هۆکارەکە تەنها ئەوە نەبوو کە **تەکفیری نەکرد** ئەگەرچی تەکفیر نەکردنی کوفرە بەبێ گومان ، چونکە ئەو بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکرد بەڵام ئەمە لێکۆڵینەوەیە لە نەقڵ کردن و علمی و ووردبینیەکەی ، وە خەواریجەکانیش ئەوانەی کە دار کۆدەکەنەوە لە شەودا نەقلی دەکەن لە هەرکەسێک کە قسەی دەکرد و دەڕۆیشت!!

# گومانی دوانزەیەم :

**خەواریجەکان** دەڵێن : **هەرکەسێک کوفرکردن بە طاغوت ئاشکرا نەکات ئەوا ئەو کەسە کافرە بە الله** ..!!

## وەڵام :

ئەو قسەیەی کە دەڵێن : مرۆڤی موسلمان ئیسلامەتیەکەی لە ڕووکەشدا درووست نابێت ، تەنها کاتێک کە تەکفیر کردنی طاغوتەکان و بەڕائەت کردن لێیانی ئاشکرا کردووە ، ئەمە قسەیەکی بیدعەیە و داهێنراوە وە هیچ پاڵپشتێکیان نییە لە بەڵگە و ئەثەردا ، بەڵکو لە پێشوودا بەڵگەی زۆرمان هێناوەتەوە و ڕەدمان داونەتەوە لەسەر حوکم دان بە ظاهر وە هەروەها لە ووتەی ئەهلی عیلم.

وە ئەمەش کەلامی **عبد اللطیف** ی کوڕی **عبد الرحمن** ی کوڕی **حسن** ی **آل الشیخ** کە ڕەدی ئەو بیدعەیە ئەداتەوە و دەفەرموێت : ( دووپیام بینی لە هاوشێوەی ئێوە دەرچوون لە شاری **الأحساء** و وازیان هێنابوو لە **جومعە** و **جەماعەت** وە هەموو ئەوەی لەم وڵاتە بوو تەکفیریان کرد وە بەڵگەکانیان هەمان قسەکانی ئێوە بوو ، ئەیان گووت : خەڵکی شاری **ئەحساء** دانیشتن دەکەن لەگەڵ **ابن فیروز** ، وە تێکەڵاویان دەکەن ئەوانە و هاوشیوەکەنیان بەم کارەیان ( کوفریان بە طاغوت نەکردوە .. ) ئەو زێدەڕەوانە ئەیانگوت : هەرکەس تەکفیرکردنیان دەرنەبڕێت بە ئاشکرا ، ئەوا **کافربووە بە الله** و **کوفری بە طاغوت** نەکردوە وە ئەوەشی لەگەڵی دابنیشێت ئەویش وەک ئەوە بەو قسانەی کە ڕێکیان خستبوو بۆ خویان و خەڵکیان پێ تەکفیر دەکرد

وایـان لێهـاتبوو وازیـان لەوەڵامـدانەوەی سـەلام هێنـابوو ، جـا ئەم کارەیـان بەمـن گەیشـت و چـووم بۆلایـان و ئامـادەبووم بەتونـدی قسـەم لەگەڵ کـردن و هەڕەشەم لێکردن.

**جا لە یەکەمدا ئەو بانگەشەی دەیانکرد ئەوەیە کە دەیانگوت :**

ئەوان لەسـەر **عەقیـدەی شـیخ محمـدی کـوڕی عبـد الوهـاب** ــن ، وە ئەمەش پەیامەکـانیەتی کە لەلایـانە ، جـا منـیش شـوبهە و گومانەکانیـانم بـۆ دەرخسـتن وە گومڕایەتیەکەیــانم بەتــاڵ کــردەوە بەوەی کە خــۆم ئامــادە بـــووم لە مەجلیســەکە وە پـێم ڕاگەیانـدن لە بەڕائەتـی شـێخ لەم بیـرو بـاوەڕ و مەذهەبە ، وە ئەو تەکفیـر ناکـات ئـیلا بەوە نەبێـت کە موسـلمانان ئیجماعیـان هەیە لەسـەر تەکفیـر کردنـی ئەنجـام دەرەکەی لە : **شـیرکی گەورە** ، و **کـوفر کـردن بە ئایەتەکـانی اللـە** و **کـوفرکردن بە پێغەمـبەرەکەی** ، یـان بە شـتێک لێـی ، لەدوای پێگەیانـدنی بەڵـگە و حـوجـە ، وە بلـوغیەکەی مـوعتەبەر بێـت ، وەک تەکفیـر کـردن لەبەر پەرسـتنی **پیاوچاکـان** و دوعـاکردن لەبەریـان لەگەڵ اللـە ــدا ، وە کردنیـان بە چەنـد هاوبەشـێک بـۆ اللـە لەوەی کە تەنهـا شـایەنە بە اللـە لەسـەر درووسـتکراوەکان لە عیبـادەت بـۆ کـردن و پەرسـتنی ، وە ئەمەش هەمـووی ئیجماعـی لەسەرە لەلایەن ئەهلی عیلم و ئیمان ....

**دەڵێم :**

ئەم زانـایە یەکـێکە لەوانەی کە خەواریجەکـان بەڵـگە بە قسـەکانی دەهێـنـنەوە بـۆ بیـدعەکەیان و گومڕاییەتیەکەیـان ، جـا سـەیر بـکە چـۆن ئەوەی لەبەر دەسـتیاندابوو هەڵیوەشـاندەوە و چـۆن بە تونـدی قسـەیانی لەگەڵ دەکـرد هەروەها وەک بڵێی کە خەواریجەکانی سەردەمیش وا لەلایەتی..... !!

# گومانی سێنزەیەم :

هەروەهــا **دەڵــێن : ئەگەر حــاکم و دەســەڵاتدار کــافر بــوو ئەوا رعــیە و ژێردەستەکانیشی کافر بوونەتەوە !!**

## وەڵام :

بەڕاسـتی ئەهلــی سـوننە دەربــارەی بــابەتی حوکمـدان بەپێــی دار قســەیان کـردووە ، بەڵام ئەوان جیــاوازی دەکەن لە حــوکم دان لەنێـوان دار و لەنێـوان دانیشـتووەکانی ، جــا نەیــانگوتووە هەرکاتێــک حــاکم کەوتە نــاو کــوفرە ، داریـش دەبێـتە کـوفر! یــان ڕەعیەکــانیش کــافر بــن ، چــونکە حــاکم ڕەنــگە بکەوێــتە نــاو کــوفرەوە ، وە دارەکەش هەر لەژێــر دار الإســلام دەمێنێــتەوە ، وە ئەمەش لەوکــاتەیە کە کــوفرەکەی هەر بۆخــۆی بــوو ســنووری نەبەزانــد بــۆ غەیــری خــۆی ، جــا ئەگەر شــەریعەتی ئیســلامی لابــرد و دووری خســتەوە وە حــوکم بە شــەریعەتی شــەیتان کــرد ، ئەوا لەوکــاتەدا دارەکە بــووەتە دار الکفــر لەبەر زاڵبــوونی ئەحکــامی کــوفر بەســەریدا ، بەڵام ڕەعیەکــانی کــافر نــابن بە تەنهــا بەهــۆی کــوفری حــاکمەوە ، بەڵکــو ئەو کــاتە کــافر دەبــن ئەگەر لەســەر کــوفرەکەی شــوێنی کەوتــن ، جــا ئەگەر دار بــووە دار الکفــر ، ئەوا بەمانــای ئەوە نــایەت کە هەمــوو ئەهــلەکەی کــافرن ، بەڵکــو ڕەنــگە بــێ شــوومار موســلمانی تێــدابێ ، هەروەکــو لە مەکەدا هەبــوو ، کە لەو ڕۆژەی دار الکفــر بــوو ، بەڵام چەنــدین پیــاو و ئــافرەتی تێدابوو کە موســلمان ببوون لەگەڵ ئەمەش تــێکەڵ ببــوون لەگەڵ موشریکەکــان ، کەچــی **اللــه تعــالی** نــاوی موســلمانی لێیــان نــا ، وەک فــەرموویــەتــی: ( **ولولا رجال مؤمنون ونساء مؤمنات لم تعلموهم** ).

# گومانی چواردەیەم :

**خەواریجەکان** ووتەیەکی شێخ محمەدی کوڕی عبدالوهاب دەهێننەوە کە گوتوویەتی : **ئیسلامەتی هیچ موسڵمانێک جێگیر نابێت ئەگەرچی الله تعالی ی بە تاک و تەنها پەرست و وازیشی لە شیرک هێنا " تەنها بە دەرخستنی دوژمنایەتی نەبێت بۆ موشریکان .**

## وەڵام :

ئەم ووتەیەی شێخ ئەوە دەخوازێت کە دەبێت **تەکفیری** هەموو ئەو کەسانە بکەیت کە دوژمنایەتی موشریکانیان دەرنەخستووە ، وە هیچ کەسێک لە کوڕی ئادەم ئەمەی نەگوتووە ، بە درێژایی ئەوەشی کە گەڕاوم لە کتێبەکانی سەلەف و ئەثەرەکان نەمبینیوە لە دەربڕینی ئەم جۆرە قسەیە بەبێ تەفصیل ، بەڵکو هەتاوەکو شێخیش پابەندی ئەوە نەبووە وە ڕوونی کردووەتەوە کە ئەو **تەکفیری عموم ناکات** ، جا **خێزانی فیرعەون دوژمنایەتی کردنی فیرعەونی مێردی و دارو دەستەکەی دەرنەخست** ، وە **ئەو پیاوە بڕوادارەی ئالی فیرعەون دوژمنایەتی کردنی قەومەکەی دەرنەخست** ، بەڵکو **ئیمانەکەشی شاردبوویەوە** ، وە هەروەها **نەجاشی دوژمنایەتی کردنی قەومەکەی دەرنەخستبوو** ... هتد ..... وە سەدان نموونەی هاوشێوەی ئەمە هەیە ، بەڵکو هەندێک لە قوتابییەکانی و نەوەکانی شێخ ئەو نەصەیان ئاراستە کردووە بە کەمالی تەوحید نەوەک بە صەحەتەکەی وە فەرموویانە : شێخ فەرموویەتی : (**جێگیر نابێت** وە نەیفەرمووە صحیح نابێت ) وە ئەمەش ئاراستە کردنێکی چاکە بۆ ئەو دەربڕینە تێکەڵاوە ، وە **عبد اللطیف آل الشیخ** لە کتێبەکەی

( **مصـباح الظـلام** ) نوسـيويەتی لە وەڵام دانەوە دەربـارەی نمـوونەی ئەو جـۆرە دەربڕینـانە کە **شـێخ محمـدی کـوڕی عبـد الوهـاب** ـــی پــێ تۆمەتبـار کـراوە کە **تەکفیـر عمـوم دەکـات !!** هەروەکوچـۆن ئەمەش شـاراوە نیـیە وە ڕووی ئەو نەصەش وەک ئەوەیە کە هەواڵم پێدایت.

# گومانی پانزەیەم :

**خەواریجەکان بەڵگە دەهێننەوە بە ووتەیەکی إبراهیم علیه الصلاة والسلام کە فەرموویەتی : جگە لەمن کەسیتر نییە لە زەویدا الله بپەرستێت..**

## وەڵام :

ئەم خەبەرە ڕیوایەت کراوە لە **أبو هورەیرەوە** الله لێی ڕازی بێت فەرموویەتی : **رسول الله** صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی : ( **کاتێک إبراهیم خرایە ناو ئاگرەکەوە فەرمووی : خودایە تۆ لە ئاسمان بە تەنهای ، وە منیش لە زەویدا تەنهام کە دەتپەرستم** ) .

ئەو فەرموودەیە سەرەڕای مەشهوریەکەی بەڵام **صەحیح نییە** و **باطل** و **منکر**ە ، ئەمەش لە تەخریجەکەیدا دەردەکەوێت : هذا الحديث رواه الدارمي في الرد على الجهمية (75) وفي النقض على المريسي (1/490) والبزار في مسنده (9047) وأبو نعيم في حلية الأولياء (1/19) وأبو يعلى - (3/103/2349 كشف الأستار (والخطيب في تاريخ بغداد (10/346) وأخرجه ذاك الذهبي في ترجمة أبي هشام واسمه محمد بن يزيد الرفاعي الكوفي وذكر اختلاف العلماء فيه - من طريق الحسن بن سفيان :حدثنا محمد بن يزيد الرفاعي به

ثم ضعفه بقوله : غريب جدا . " ثم تناقض فحسنه في العلو!!

**قال البزار :** ( وَهَذَا الحديثُ لاَ نَعْلَمُ رَوَاهُ عَنْ عَاصِمٍ إلا أبو جعفر ولا عن أبي جعفر إلا إسحاق ولم نسمعه إلا من أبي هشام ).

وضعفه الهيثمي في مجمع الزوائد (8/202) بل حتى ذاك الألباني على تساهله المعروف ذكره في الضعيفة وضعفه !!

**دەڵێم :**

ئەمە حەدیث ـێکی **زۆر زەعیفە** و **منکر** ـە دوو علەتی تێدایە :

**یەکەم :** أبـو جەعـفەرە ، کە عیسـای کـوڕی أبـو عیسـای عــبداللە ـــی کـوڕی ماهان کە کەسێکی زەعیفە.

**دووەم :** أبـو هشـام ، کە ئەویـش بوخـاری لەبـارەیەوە فەرمـوویەتی : بینیـومە کە یەکدەنگ بوونە لەسەر لاوازیەکەی.

جـا سـەیربکە بـزانە خەواریجەکـان بەڵـگە بەچـی دەهێنـنەوە !! بەردەوام یـان فەرمـوودەیەکی مـونکەرە یـان ڕاو بۆچـوونێکە بە بـێ ئەثەر ، جـا ئایا چ کەسـێک بەم قسانەیان ڕازی دەبێت کە ئەمە حاڵیەتی ؟؟؟

بەڵکـو هەتـاوەکو ئەگەر گریشـمان صـحیح بـوو ئەمە نـابێتە حـوجـجە و بەڵـگە چـونکە إبـراهیم یەکـێکە لە پێغەمبەران و وەحـی بـۆ هـاتووە هاوشـێوەی ئەو خەبەرە هەروەکـو چـۆن لەم خەبەرە هـاتووە کە وەحـی هـات بـۆ نـوح علیـە السـلام وتـرا : ( **أنـە لـن یـؤمن مـن قومـك إلا مـن قـد آمـن** ). دەبــێ چاکبزانیـت کە جـگە لەوانە لەمەو بەر بڕوایـان هێنـاوە ، ئیـتر کەسـێکی دی لە هـۆزەکەت بـاوەڕ نــاهێنێ. وە لەو بەڵگانەشـــی کە دووپــاتی ئەو شـــوبهەیە دەکــاتەوە و هەڵیدەوەشێنێتەوە ئەو ووتەیەی **الله تعالی** ـیە کە فەرموویەتی:

( قـالَ فَـما خَطـبُكُمْ أَيُّهَـا الْمُرْسَـلُونَ (31) قـالُوا إِنَّـا أُرْسِـلْنا إِلى قَـوْمٍ مُجْـرِمِينَ ( 32 ) لِنُرْسِـلَ عَلَـيْهِمْ حِجـارَةً مِـنْ طِـينٍ ★ مُسَـوَّمَةً عِنْـدَ رَبِّـكَ لِلْمُسْرِفِينَ ★ فَأَخْرَجْنـا مَنْ كانَ فِيها مِنَ الْمُؤْمِنِينَ ★ فَما وَجَدْنا فِيها غَيْرَ بَيْتٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ )

واتە : **ئیبراهـیم** وتـی : چیتـان پـێ سـپێردراوە ئەی نێراوانـی خـــودا ★ وتیـان بێگومـان ئـێمە نێـرراوین بـۆ سـەر گەلـی تاوانبـاران ★ بـۆ ئەوەی ببـارێنین بە

سەریاندا بەرد لە گڵی سورەوە کراوی ★ نیشانە کراو لەلایەن پەروەردگارتەوە بۆ لە سنوور دەرچوان ★ ئینجا هەرچی بوو لەو شارەی لووط دا لە بڕواداران دەرمان کردن ★ وە نەماندی تێیدا بێجگە لەیەك ماڵی موسوڵمان نەبێت ئەویش ماڵی **لووط** بوو ★ سورەتی الذاريات ـ تەفسیری پوختە

## دەڵێم :

جا ئەو موسلمانانەی کە تیای بوو جودای کردنەوە وە نەیبەستانەوە بە **تبعية** و حوکم دان بەپێی دار.

**قتادە** فەرموویەتی : دەربارەی ئەو ووتەیەی **الله تعالى** : ( فَمَا وَجَدْنَا فِيهَا غَيْرَ بَيْتٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ )

فەرموویەتی : ( **ئەگەر لەم ماڵەش زیاتری تێدا بوایە ئەوا الله ڕزگاریانی ئەکرد ، بۆ ئەوەی بزانن کە ئیمان لەلای الله پارێزراوە بە زایە ناچێت لەسەر ئەهلەکەی**).

**إبن أبي زمين** لە تەفسیرەکەی : (4/288) ( فَمَا وَجَدْنَا فِيهَا غَيْرَ بَيْتٍ من الْمُسلمين ) فەرموویەتی :

**واتە :** ئەهلی ماڵی **لوط** لەنێو کەسوکارو نزیکەکانی ، وە ئەوانەی کە لەگەڵیدا بوون لە ئیمانداران.

# گومانی شانزەیەم :

**قسەیەکی زەیدی کوڕی عەمڕی کوڕی نفیل بە بەڵگە دەهێننەوە کاتێک بە قورەیشیەکانی گووت : ئەی کۆمەڵی قورەیش واللە هیچتان لەسەر دینی ئیبراهیم نین تەنها من نەبێ .**

## وەڵام :

ئەم وتەیەی **زەیدی کوڕی عەمڕی کوڕی نفیل** تەنها ئاراستەی قورەیشی کردووە ، وە قورەیش ـیش هۆزێکی ناسراو بوون بە ئامادەبوونی گەورەکانیان کە لەلای ئەو بوونە لەبەرئەوەی ئەوان لە قەومەکەی خۆیەتی ، بۆیە تەکفیری ئەوانەی کرد کە لەلای بوون و ئاراستەی ئەوانی کردووە ، خۆ نەیگووت خەڵکی سەر زەوی هەر هەمووی کافرە ، وە هەتا ئەگەر ئەوەشی گوتبێ ئەمە بەڵگە نییە ، چونکە ئەوە پێش ناردنی پێغەمبەر بووە صلى الله عليه وسلم بۆ قەومێکی موشریک و بت پەرست لە باب و باپیرانیانەوە ، ئەوە هەر لە بنچینەدا بەڵگە نییە ، وە هۆزی قورەیش و گوندەکانی دار الكفری أصلی بووە هەروەک سەلەف فەرموویانە ، بۆیە جائیزە حوکمی عام بدرێت بەسەری ، چونکە دار الكفری ئەصلی ڕاجیاوازی تێدا نییە کە یەکێک حوکمی عام بدات بەسەریدا ، **بەڵام پرسیارەکە ئەوەیە :** ئەگەر زەیدی کوڕی عەمر پیاوێکی ببینیبوا یە لە قورەیش کە نوێژ دەکات و هاوبەش بۆ اللە بڕیار نادات ، ئایا هەر تەکفیری دەکرد بە تبعیة و حوکم دان بەپێی دار یان چی دەکرد ؟؟؟ لێرە مەبەستم ئەو قسەیەیە کە لێی ڕادەکەن !!!

# گومانی حەڤدەیەم :

**چەند قسەیەکی سەلەف باسدەکەن لەوەی کە خەڵکی موسلمانن لە ئەحکامەکانیان وە ئیسلام اعتبار بە ظاهر و ڕووکەش دەکات لە مامەڵە کردن لەگەڵیان .. پاشان لە پەیامەکەدا دەڵێن ئەمە تەنها تایبەتە بە دار الإسلام !!**

## وەڵام :

چەند سەیرە ئەو خەواریجانە ئەوەی کە بەڵگەیە بۆیان وە ئەوەشی بەڵگەیە لەسەریان دەیهێننەوە وە هیچیش لێی تێناگەن !!

بۆچی سەلەف ئاشکرایان نەکردووە کە ئەم کەلامە گشتیانە تەنها تایبەتە بە دار الإسلام هەتاوەکو ئێوە بێن بۆیان ڕاست بکەنەوە ؟؟ پاشان ئەو تایبەتکردنە لە کوێیە لە نەصەکان و کەلامی سەلەف بە مەرجێک کە ببێتە کەلامێکی صەریح و ڕوون ؟؟؟ ئەگەر بەڵگەیەکتان لەلایە لەسەر ئەو تایبەت کردنە ( ئەوا ئەگەر ماوەی سەد ساڵی تریش بوو بیهێنن ) بەڵام بەڵگەیەکی صەریح و ڕوون بێت لەسەری بەڵام ئەگەر تەنها ڕاو بۆچوونێک بێت ئەوە فڕێی بدە !.

# گومانی هەژدەیەم و کۆتایی :

**خەواریجەکان بەڵگە دەهێننەوە بە أصحاب الکهف ، دەڵێن ئەوەتا ئەوانیش تەکفیری عمومی قەومەکەی خۆیانیان کردووە کە لە قورئاندا هاتووە :**
( هَٰٓؤُلَآءِ قَوۡمُنَا ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً ) **واتە : ئا ئەوانە کە گەلەکەی ئێمەن بێجگە لە الله پەرستراوی تریان بۆ خۆیان بڕیار داوە..**
**بە عام قسەکەیان کردوو شیرکیان پاڵدا بۆ قەومەکەیان..!**

## وەڵام :

**یەکەم :** ئەوان کاتێک ئەو قسەیان کرد کە لەبەردەم پاشا ستەمکارەکە وەستابوون ، هەروەک لە ئایەتەکەی پێش ئەو هاتووە کە **الله تعالی** دەفەرموێت : ( **إذ قاموا** ) **واتە :** ئەوکاتەی وا ڕاپەڕین و لەبەر دەستی پاشا ستەمکارەکەدا وەستان..

**چونکە** ئەوانەی ئیمانیان هێنابوو ئەوکات لەوێ ئامادە بوون و چونکە ئەوان ژمارەیەکی دیاری کراو بوون لەوانەی کە ئیمانیان هێنابوو لە قەومەکەیان ، لەبەرئەوەی هەموویان بە یەکەوە کۆدەبوونەوە و یەکتریان دەناسی گومانی ئەوەیان نەدەکرد کە کەسێکی تری موەحید هەبێت لە قەومەکەیان چونکە ئەوەی ئیمانی هێنابوا لەگەڵ ئەواندا کۆدەبوویەوە ، بەڵگەش لەسەرئەوە ئایەتەکەی دوای ئەوە کاتێک کە هەندێکیان فەرمانیان بەهاوڕێکانی تریان کرد بۆ ئەوەی پەنا بەرن بۆ ئەشکەوتەکە ( وَإِذِ ٱعۡتَزَلۡتُمُوهُمۡ وَمَا يَعۡبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ فَأۡوُۥٓاْ إِلَى ٱلۡكَهۡفِ يَنشُرۡ لَكُمۡ رَبُّكُم مِّن رَّحۡمَتِهِۦ وَيُهَيِّئۡ لَكُم مِّنۡ أَمۡرِكُم مِّرۡفَقًا ) **واتە :** هەندێکیان وتیان : جا ئێستە کە ئێوە بڕیارتانداوە خۆتان دوورە پەرێزی بگرن

لەم خەڵکە و لەوشتانە کە لە جیاتی **اللـه** دەیانپەرستن ، تەنها اللـه پەرستی بکەن ، دە پەنا بەرنە ئەشکەوتەکە ، ئەو کاتە پەروەردگارتان ڕەحمەت و میهرەبانی خۆیتان بەسەردا پەخش دەکاتەوەو هۆکاری حەوانەوەتان بۆ دابین دەکات.

بۆیە ئەمەش هیچ گومانی تێدا نییە ئەگەر کۆمەڵە کەسێک لەسەر مەبدەئـو بیرو باوەڕێک کۆببنەوە ئەوا ئەوەی لەگەڵ خۆیان نەبێ بە غەیری بیرو باوەڕەکەی خۆیان دەزانن ...!!

وە **اللـه تعالى** ـش دووپاتی ئەوە دەکاتەوە کە ئەوان ژمارەیەکی دیاری کراو بوون لە قەومەکەیان کە دەفەرموێت: ( سَيَقُولُونَ ثَلَٰثَةٌ رَّابِعُهُمْ كَلْبُهُمْ وَيَقُولُونَ خَمْسَةٌ سَادِسُهُمْ كَلْبُهُمْ رَجْمًا بِٱلْغَيْبِ وَيَقُولُونَ سَبْعَةٌ وَثَامِنُهُمْ كَلْبُهُمْ قُل رَّبِّىٓ أَعْلَمُ بِعِدَّتِهِم مَّا يَعْلَمُهُمْ إِلَّا قَلِيلٌ ) **واتە :** ئەوسا هەندێکیان دەڵێن ئەو لاوانە سێ کەسن و چوارەمیان سەگەکەیانە وە هێندێ تریان دەڵێن پێنج کەسن و شەشەمیان سەگەکەیانە ئەمانە قسەی بێ بەڵگەن تفەنگ بە تاریکە شەوەوە دەنێن هەندێ تریان دەڵێن : ئەوانە حەوت کەسن هەشتەمەکەیان سەگەکە یانە ئەی موحەممەد صلى الله عليه وسلم (( **بڵێ پەروەردگارم زاناترە بە ژمارە یان کەمێ نەبێ لە خەڵکی ژمارەیان نازانێ** ))

کەواتە ئەمە هەر لە ئەصلدا بۆ ئێوە بەڵگە نییە کە بیهێنن بەسەر ئێستادا تطبیقی بکەن ..

**دووەم :** ئەم عومومیانە ئەوەنە تێنەگەیشتوون قسانێک دەکەن کە بەڵگەیە لەسەر خۆیان نەوەک بەڵگە بێت بۆیان ، کە هەر لە أصحاب الکهف بەڵگە بەم قسەیەشیان دەهێننەوە کە گوتیان : ( فلینظر أیها أزکی طعاما ) **واتە :** با سەیرکات کێ لە خەڵکی شار خۆراکی پاکترە ئەوە با لەوە خۆراکتان بۆ بێنێ .
دەڵێن : ئەوەتا ئەوان لەدوای خواردن و سەربڕاوێکی حەلاڵ دەگەڕان چونکە سەربڕاوی قەومەکەی خۆیان نەدەخوارد.

## جا ئەمە لە چەند ڕوویەکەوە بەڵگەیە لەسەر خۆیان :

**یەکەم :** سەربڕین یەکێکە لە شەعائیرەکانی ئیسلام و أصحاب الکهف ـیش حوکمیان بە شەعائیر ـدا نەوەک بە اظهار کردنی تەوحیدەکەی ، بەڵگەش لەسەرئەوەی کە سەربڕین لە شەعائیرەکانی دینە اللە تعالی دەفەرموێت: ( ذلك ومن یعظم شعائر اللە فإنها من تقوی القلوب )
سورەتی الحج 32
ئای عومویەکان خۆتان خستە ناو چ چاڵێکەوە ، کەواتە أصحاب الکهف ـیش شەعائیری بوون وەک چۆن بەم شێوەیە بە ئێمەی دەڵێن!!

**دووەم :** ئایا سەربڕینی ئاژەڵ موشتەرەکە لەنێوان کافر و موسلمان ؟؟ ئەوە بێگومان دەبێت بڵێن : **بەڵێ** ، چونکە حاشا هەڵنەگەرە هەم کافر وە هەم موسلمانیش ئاژەڵ سەردەبڕێ کەواتە موشتەرەکە ، جا ئایا أصحاب الکهف حوکمیان بەسەر شتێک نەکرد کە موشتەڕەکە لەنێوان کافر و موسلمان ؟؟
**بەڵێ بێگومان** ! نەیانگوت لەوێ موسلمان و کافری لێیە و بزانن کامەیان

اظهـاری تەوحیـدی کـردووە ئەوا خـواردن و گۆشـتەکە لەو بکـڕن ! بەڵکـو حوکمیـان بە شـتێکدا کە موشـتەرەکە ! ئەی کەواتە بـۆ تێنـافکرن و لەکوێیـە بیـر و هۆشـتان ! بـۆیە بەڕاسـتی **عمومیەکـان** سـەلەف لە ئێـوە بەریە و جیـاوازی نێوان مەنهەجی ئێوە لەگەڵ سەلەف جیاوازی نێوان ئەرز و ئاسمانە....!!

# ئايا تەكفير كردن ئەصلێكە لە أصلەكانى دين ؟؟

**وە يەكێـك لەو گومانـانەى كە خەواريجەكـان موەحيـدانى لەسـەر تەكفيـر دەكەن ئەوەيە كە موەحيـدان تەكفيـر كـردن بە يەكێـك لە واجباتەكـان دادەنـێن بەڵام خەواريجەكـان بە أصـلى دينـى دادەنـێن ، جـا لەسـەر ئەمە موجاهيـدانى موەحيـد تەكفيـر دەكەن ، جـا بـا بـزانين ئايـا تەكفيـر كـردن يەكـێكە لە ئەصلەكانى دين.**

## وەڵام :

### يەكەم :

ئەم بـابەتە قسـەيەكى زۆرى تێـدا كـراوە ، وە خـيلاف و ڕا جيـاوازيەكى تونـدى لەسـەرە ، وە ئەم ڕا جيـاوازيەش بـۆ نەبـوونى زانيـارى لەسـەر وردەكـارى ئەم ڕا جيـاوازيە دەگەڕێـتەوە وە ديـارى كردنـى ئەم ڕا جيـاوازيە ، جـا بە تەوفيـق ـى **اللـه تعـالى دەڵێـين : كـوفر كـردن بە طـاغوت بنچيـنە و ئەصـل ـێكە لە ئەصـلەكانى ديـن ، وە واتـاى ئەم قسـەيەمان كە دەڵێـين " أصـل " ئەوەيە كە وەرگيـراوە لە " الفطـرة " بەڵام تەكفيـر كردنـى طـاغوت ـەكان لە پێويسـتيەكانى لـوازم ـى كـوفر كـردنە بە طـاغوت ، كە مرۆڤـى موسـلمان تێيـدا پێويسـتى بە فێربوون و زانين دەبێت .**

**دووەم :** لێرەدا جیاوازی هەیە لە نێوان **کوفر کردن** و **تەکفیر کردن** :

جـا **کـوفر کـردن بە طـاغوت ئەصـلێکە لە ئەصـلەکانی دیـن** بەڵام **تەکفیـر کـردن حـوکمێکی شـەرعیە بەهـۆی عەقـڵ ــەوە ناتوانێـت لێـی تێبگـات** و **هەسـتی پـێ بکـات بەڵکـو بەهـۆی ئەدیـلە** و **بەڵـگەی شـەرعیەوە لێـی تێـدەگات** و **هەسـتی پـێ دەکات.**

**سـێیەم : ئەصـلی دیـن** بـریتییە لە : **تەوحیـد و وازهێنـان لە شـیرک وە ئەمەش مـرۆڤ شـارەزا و تێگەیشـتوو دەبێـت بەهـۆی** فیـترەتەوە ( الفطـرة ) بەڵام **تەکفیـر کردنـی موشریکـان** **پێویسـتیەکە لە پێویسـتیەکانی تەوحیـد** ، وە ئەمەش شـارەزا و تێگەیشـتوو دەبێـت بەهـۆی **بەڵـگەی شـەرعیەوە** ، جـا هەرکەسـێک بەڵـگەی پـێ گەیشـت لەسـەر **کـوفری یەهـودی** و **گاورەکـان** و موشریکەکـان بەڵام بە کافریـانی نەزانـی ، ئەوا ئەم کەسـە دەبێـتە **مُکـذب** و **بـاوەڕ پـێ نەهێـنەری قورئـان و سـوننەت** جـا ئەم هەڵوەشـێنەرەوەیە **نەبـوونی تەکفیـر** و **باوەڕ پێ نەبوونە.**

**چـوارەم : کـوفر کـردن بە طـاغوت ڕوکنـێکە لە ڕوکنەکـانی " لا إلـه إلا اللـه "**

**اللـه تعـالى** دەفەرموێـت : ( فَمَـن يَكْفُـرْ بِالطَّـاغُوتِ وَيُـؤْمِن بِاللَّـهِ فَقَـدِ اسْتَمْسَـكَ بِـالْعُرْوَةِ الْـوُثْقَىٰ لَا انفِصَـامَ لَهَـا وَاللَّـهُ سَـمِيعٌ عَلِـيمٌ ) **واتە :** ئێنجـا هەر کەس لە ڕێـی بـێ بڕوایـی بگەڕێـتەوە بـێ بـاوەڕ بـێ بە هەر پەرسـتراوێک جـگە لە **اللـه** وە بـڕوا بهێنـێ بە **اللـه** ئەوە بێگومـان بە تونـدی دەسـتی گرتـووە بە دەسـتەگیرەیەکی قـایمی بەهێـزی وا کە **ئیسـلام** ، یـان ئیمانەکەیەتـی کە پچـڕان و بەربوونی بۆ نییە ، وە خـودا بیسەری زانایە. البقرة : ٢٥٦ ــ تەفسیری پوختە

جـا هەرکەسـێک **کـوفر نەکـات** بە **طـاغوت** ئەوا هەر لە بنچیـنەدا ئیمانـی بە اللـه نەهێنـاوە. بەڵام **تەکفیـر کردنـی طـاغوت** و **موشریکەکـان** ئەوا لە **پێویسـتیەکانی کـوفر کـردنە** بە **طـاغوت**. جـا ئـیمان و بـاوەڕی بەنـدە تەواو نابێـت تـاوەکو کـوفر دەکـات بە **طـاغوت** وە کـوفر بە **طـاغوت** ـیش نـایەتە دی تـاوەکو **تەکفیـری طـاغوت** دەکـات و **ڕقـی لێـی دەبێـتەوە** و **وازی لـێ دەهێنێـت** و **لێـی دوو دەکەوێتەوە** و **دژایەتی دەکات.**

جـا لێـی وورد بەرەوە کە **جیـاوازی هەیە** لە نێـوان کـوفر کـردن بە طـاغوت و تەکفیـر کردنـی موشریکـان. جـا ئەگەر ئەمەی باسـکرا زانیـت و بـۆت ڕوون بـوویەوە کە **ئەصـلی دیـن** بـریتییە لە شـایەتی دان بە " **لا إلـه إلا اللـه** " وە مانـاکەی تەحقیـق کردنـی تەوحیـد و کـوفر کـردنە بە **طـاغوت** ، وە هەروەهـا لە **کـوفر کـردن بە طـاغوتیش** لازم و پێویسـت دەبێـت کە **تەکفیـری ئەهلـی** طـاغوت و شوێنکەوتووانی و پشتیوان و سەرخەرانی بکەیت.

وە هەروەها **خەواریجەکان** بەڵگە دەهێننەوە بەم ووتەیەی **الله تعالى** بەوەی کە **تەکفیر** لە **أصلی دینە**: ( قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِي إِبْرَاهِيمَ وَالَّذِينَ مَعَهُ إِذْ قَالُوا لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَآءُ مِنْكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةُ وَالْبَغْضَاءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَحْدَهُ ) **واتە :** بەڕاستی بۆ ئێوە هەیە سەر مەشقێکی جوان و چاک لە **ئیبراهیم** و لەوانەشی کە لە گەڵیدا بوون ، کە بە **گەلەکەی** خۆیانیان گوت : بەڕاستی ئێمە بێزار و بەرین لە ئێوە وە لەو شتانەشی کە لە شوێنی **الله** دەیانپەرستن ، ئێمە باوەڕمان نییە بە ئایینی ئێوە ، وە لە نێوان ئێمە و ئێوەدا پەیدا بووە **دوژمنایەتی** و **کینە** بۆ هەمیشە تا کاتێک کە بڕوا بە تاک و تەنهایی **الله** دەهێنن .

**یەکەم :** ئەم ئایەتە پیرۆزە لە **مەدینە** دابەزی لەدوای **صولحی الحدیبیة** ، وە **جمهوری موفەسیرەکانیش** لەسەر ئەمەن !! وە لە شەریعەتدا یەکەمین شتێک کە دانی پیانراوە کە پێی داوا لە بەندەکان دەکرێت " **أصلی دینە** " بۆئەوەی **بچنە ناو دینی الله جل وعلا** وە بۆئەوەی **ئیسلامەتی** و **تەوحیدە**کەیان **صحیح** بێت.

جا لێرەدا پرسیار دەکەین لە **غولاتەکان** ئایا **أصلی دین** لەماوەی **سێزدە ساڵ** لە **مەککەدا** کامل و تەواو نەبوو هەتاوەکو ئەم ئایەتە پیرۆزە دابەزی و ئینجا تەواو و کاملی کرد ؟ !! حاشا وکلا.

جا **أصلی دین** کامل ببوو و ڕوون و ئاشکرا ببوویەوە لەپێش دابەزینی ئەو ئایەتە وە **پێغەمبەر** و نێردراوەکان گشتیان بانگەوازی خەڵکیان کردووە بۆ

**تەوحیدی** پەروەردگاریان جل وعلا وە **إخلاص** و **دڵسۆزی** لە **عیبادەت** کردنیان بۆ **الله** وە **پشتکردن** و **دوورکەوتنەوە** لە بت و پەیکەرەکان وە خۆ بەری کردن لەو هاوتا و پەرستراوانەی کە لە شوێنی **الله** دەپەرسترێت ، وە ئەمەش هاوەڵە بەڕێزەکان فێری ببوون و لێی تێگەیشتبوون هەر لە **مەککەدا** وە کاریشیان پێی کردبوو ، وە بەردەوامیش بوون لەسەری پێش دابەزینی ئەو ئایەتەی **سورەتی الممتحنة** بەڵام جاهیلیەتی **خەواریجەکان** وای کردووە کە نەزانن و لێی تێنەگەن و عەقڵ و بیرو هۆشیان بەکار نەهێنن. وە هەروەها لای **خەواریجەکان** یەکێ لەو زانایانەی کە لە فلتەرەکەیان بە سەلامەتی دەرچووە **ئیمامی ئەهلی سوننەیە** ، بەڵام نازانم لەدوای ئەو **ئەثەرەی** کە ئێستا باسی ئەکەین حوکمی چی ئەدەن بەسەری ، چونکە **خەواریجەکان** تەنها لەسەر دوو شت ئێمە **تەکفیر** دەکەن **ناڵێین تەکفیر ئەصلی دینە** وە **تەکفیری عام** ناکەین !!! جا لە ووتەکەی **ئیمام أحمد** دەردەکەوێت کە **تەکفیر حوکمێکی شەرعیە** نەوەک **ئەصلی دین :**

**ئیمامی ئەحمەد** رحمە اللە لەبارەی **جەهمیە موشریکەکانەوە** دەفەرموێت :

( كنت لا أكفرهم حتى قرأت آيات من القرآن ) طبقات الحنابلة / 1/414 : ط دار المعرفة

**واتە :** لە سەرەتادا **جەهمیەکانم** بە **کافر** نەئەزانی تاوەکو چەند ئایەتێکم لە قورئان خوێندەوە .

ئەو ئەثەرەی کە باسکرا روونکردنەوەی تێدایە کە **تەکفیر** **حوکمێکی شەرعی خەبەریە** ، بەهۆی **حوجەجەی قورئانیەوە** هەستی پێ دەکرێت نەوەک **عەقڵ** هەروەکو چۆن **موعتەزیلە** و **خەواریج** وا دەڵێن.

وە هەروەها بڕینی ئەو بەشەی خوارەوەی کەلامی **ابن عبدالوهاب** لەلایەن **خەواریجەکان** ( **فلا يتم مقام التوحيد إلا بهذا** ) کە بەهۆی بڕینی ئەوەنەوە **تەئویلە باطلەکەیان** ئەپێکێت و **موەحیدانیش** چەواشە دەکەن بەوەی **تەکفیر** لە **أصلی دینە**. !!!

جا هەر بە کورتی وەڵامێک لەسەر **استدلالەکەی** **خەواریج** و **غولاتی تەکفیرەکان** بە کەلامی **شێخ محمدی کوڕی عبد الوهاب** لەسەر ئەوەی کە تەکفیر لە **ئەصلی دینە**.

**يقول الإمام محمد بن عبد الوهاب رحمه الله :**

**أصل دين الإسلام وقاعدته أمران:**

**الأول :** الأمر بعبادة الله وحده لا شريك له ، والتحريض على ذلك والموالاة فيه وتكفير من تركه.

**الثاني :** الإنذار عن الشرك في عبادة الله والتغليظ في ذلك والمعاداة فيه ، وتكفير من فعله ، فلا يتم مقام التوحيد إلا بهذا.

**واتە : ئیمام محمدی کوڕی عبدالوهاب رحمە الله** دەفەرموێت :

**ئەصلی دینی ئیسلام و بناغەکەی دوو شتە:**

**یەکەم :** فەرمان کردن بە عیبادەت کردنی **الله تعالی** بە تاک و تەنهایی و بێ شەریک ، هەروەها هاندان لەسەریەوە و پشتیوانی کردنی ، وە **کافرکردنی** هەرکەس کە وازی لێ دەهێنێت.

**دووەم :** ئاگەدار کردنـەوە لـە **شـیرک** لـە عیبـادەت کـردنی **اللـه تعـالی** دا ، هەروەهـا تونـد و تیـژی نوانـدن بـەرامبـەری و بـەربـەرەکـانی کـردنی ، وە **کـافر** کـردنی هـەرکـەس کـە ئەنجـامی ئـەدا ، جـا مەقـام و پـێگەی **تەوحیـد** تەواو نابێـت تەنهـا بەمە نەبێت.

**جـا ئەو ووتەیەی کە فەرمـووی** :( **والتحـريض عـلى ذلـك وتكفـير مـن تركـه** )

وە بەهەمـان شـێوە ئەو ووتەیەی کە فەرمـووی : **( والتغلـيظ في ذلـك والمعـاداة فيـه ، وتكفـير مـن فعلـه** ) ئەوە **لە تەواویەکەیەتـی نەوەک لە ئەصـلەکەی** ، هەر لەبەر ئەمەش لە کۆتـاییەکەی ڕوونـی کـردەوە و فەرمـووی : ( **فـلا يـتم مقـام التوحيد إلا بهذا** ) تأمل !!!!!!

وە ڕەددێک لەلایەن **زانای نەجـد شــیخ عبـد اللطیـف ــی کـوڕی عبـد الـرحمن** بـۆ **خەواریجەکـان** ، کە شـیخ دەڵێـت **تەکفیـر کـردن** لە **واجبـاتی کـوفر** کـردنە بە طاغوت.

**الشيخ عبد اللطيف ـی کوڕی عبد الرحمن آل شيخ** دەفەرموێت:

**قال عبد اللطيف بن عبد الرحمن ال شيخ** :

**وأهـم شروط الصـلاة والإمامـة ، هـو : الإسـلام ، معرفتـه والعمـل بـه ، ومـن كفّـر المشركين ومقـتهم ، وأخلـص دينـه لله ، فلـم يعبـد سـواه ، فهـو أفضـل الأئمـة وأحقهم بالإمامـة ، لأن التكفـير بالشرك والتعطيـل ، هـو أهـم مـا يجـب مـن الكفـر بالطاغوت.** الدرر السنية / ج : 12 ص264

**واتە : لە گرنگترینـی مەرجەکـانی نـوێژ و ئیمامەتـی** ، **بـریتییە** لـە : **ئیسـلامەتی** ، **ناسـینی** و **کـارپێکردنی** ، وە هەرکەسـێک **تەکفیـری هاوبەشـدانەران** بکـات و ڕقـی لێیـان ببێـتەوە ، وە دینـەکەی بـۆ **اللـه** پـاک بکـاتەوە ، بـێجگە لـە **اللـه** هـیچ

نەپەرستێت ، ئا ئەو کەسە **بەڕێزترین** پێشەوا و **ئیمامە** وە شیاوترین کەسە بۆ ئیمامەتی ، چونکە تەکفیر کردن بەهۆی شیرک و تەعطیل ئەوە ئەوە گرنگترین واجبە لە کوفرکردن بە طاغوت.

**بۆ ڕەددانەوەی زۆرێک لە گومانەکان لەم کتێبە وەرگرتووە :**

**الجواب الباهر في الرد على بدعة التكفير بالعموم وقبول الإسلام الظاهر.**

## الله أعلم بالصواب

لێرەوە کۆتاییمان هێنا بە زنجیرەی وەڵامی شوبهە و گومانی خەواریجەکان

( اللهم أرنا الحق حقاً وارزقنا اتباعه وأرنا الباطل باطلاً وارزقنا اجتنابه )

**سبحان ربك رب العزة عما يصفون ★ وسلام على المرسلين ★ والحمد لله رب العالمين.**

# وڵامی

## گومانی تکفیر عمومەکان



ئامادەکردنی :
دابان تەوحیدی

دیزاین و ڕێکخستنی :
سیامەند عبدالله